لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد
زنجیرەی زیاندنەوەی کەلەپوری ئەدەبی کورد ، ژمارە (١١)

# دیوانی وەفایی

«میرزا عەبدوررەحیمی سابڵاخی»

لیکۆلینەوەی :
محەمەد عەلی قەرەداغی

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغدا ـ ١٩٧٨

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# دیوانی وەفایی

« میرزا عەبدوڕڕەحیمی سابڵاخی »

لێکۆڵینەوەی :

محەمەد عەلی قەرەداغی



چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا ــ ١٩٧٨

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# ديوان وفائي

## « المرزا عبدالرحيم الساوجبولاقي »

تحقيق

محمد على القرهداغى

مطبعة المجمع العلمي الكردي

بغداد ـ ١٩٧٨



وێنـەی لاپەڕەی یەکەمی ئـەو پارچە شیعرە فارسییەی لای کاك مەحموود ئەحمەدەوە دەستم کەوت .

وصیبەت بێ کە مردم تەخت وتابوتم لە عەرعەر کەن
هەتا عالەم بزانێ من شەهیدی قامەتی یارم

* * *

بلا مەعلوم بێ کوژراوی کێم یاران وەصیبەت بێ:
چراغی توربەتم هەر دەستە گوڵ بێ پاش وەفاتی من

* * *

غەزەلی طورفەیی من قەط نییە بەو نازکییە
بۆ لە بەرکردنی دانایی قەدرزانێ دەوێ




جگە لەوەی بەرهەم و هۆنراوەی شاعیرانی کورد بەزۆری لەناو چوە و دەست خوێندەواران نەکەوتوە و لە بلاوبونەوە بێبەش بوە ، یەکەم بار و لەکەی گەورە بەسەر هۆنراوەی بلاوکراوەی کوردییەوە لێنەکۆڵینەوە و وردنەکردنەوە و ــ دوابەدوای ئەوانەش ــ هەڵەی زۆر و ونبونی مەبەست لە هۆنراوەکاندایە • چەند دیوانێکی کوردیی وەك : (کوردیی) و ( وەفایی ) و•••• مان بەرچاو ئەکەوێ کە تا ئێستا چەند جار بەچاپ گەیێندراون و بلاوکراونەتەوە ، بەلام جێگەی داخ ئەوەیە کە ئەم دیوانانە جار لە جار هەڵەیان زیاتر بوە و جار لە جار لێکۆڵینەوەیان کەمتر بوە و باری دۆزینەوەی مەبەستی شاعیر زیاتر ئاڵۆز و نابار بوە •

بۆیە ئەگەر خوێنەرێك بیەوێ تۆزێك باری راستیی شیعرێك یان پارچە شیعرێك لە شیعری ئەو شاعیرانە بدوزێتەوە ئەبێ بە شوێن کۆترین چاپدا بگەڕێ ، کە ئەمەش پێچەوانەی باری لێکۆڵینەوە و خزمەتی وێژەیە ؛ چونکە هەر بەرهەمێك چەند جار بلاوبکرێتەوە دەبێ جار لەجار زیاتر راست بکرێتەوە و جوانتر و پوختتر پێشکەشی خوێندەواران بکرێ •

دیوانی وەفایی یەکێکە لەو دیوانانە و تائێستا چوار جار بە چاپ گەییوە، بەلام،بەداخەوە،کە هەر جارەی کۆمەڵێك هەڵەی تێدا زیاد کراوە و چەند

گوڵۆلە گرێ کوێرە ناو شیعرەکانی خراوە،بە شێوەیەك وا ئەبێ پارچە شیعرێك دەخوێنرێتەوە و هیچی لێ وەرنا گیرێ و نازانرێ باس و مەبەست لە شیعرەکەدا چییە ! ئەم دەردەش گەلێ هۆی هەیە • لە سەرۆی هەمۆیانەوە : شێوەنوسینی کۆن ــ واتە : بەکارهێنانی رێنوسی فارسیٚ لە نوسینی کوردیدا ــ کە بـە راستی کەسێك زۆر شارەزای ئەو شێوە نوسینە نەبێ و لە کێشەکانی شیعر ئاگادار نەبێ ، ناتوانێ بنچینەو بناغەی راستیٚ پارچە شیعرێکی کوردیٚ ، کە بەو شێوە نوسرابێتەوە ، بدۆزێتەوە •

هۆیەکیتر ئەوەیە : زۆری ئەوانەی تا ئێستە هەوڵی بڵاوکردنـەوەی هۆنراوە و دیوانی شاعیرانی کوردیان داوە شارەزاییەکی باشیان لە جۆرەکانی شیعردا نەبوە و چەشی هەمۆ سەرچاوە و جۆگەیەکی ئـەدەب نەبـۆون و ــ لەبەر هەر هۆیەکیش ــ نەیانویستوە کەڵك لە شارەزا و ئەدەبدۆستان وەرگرن و بۆ ساخکردنەوەی جێگەی ورد و شیعری ناسکی دیوانـەکان پەنایان بۆ بەرن ، جگە لەوەش کە هەندێ کات مەبەست لە بڵاوکردنەوەی دیوانەکان یان ناو و شۆرەت ، یان پەیداکردنی پارە و دارایی بوە !

هۆیەکیتر ئەوەیە : هەندێ لەوانـەی دیوانی شـاعیرانی کوردیـان چاپکردوە ، هەڵساون عاستەو خۆ (بە خەیاڵی خزمەت بە زمانی کوردیٚ ! ) شیعرەکانیان لە وشەی بێگانە کەو و بێژنـگ کردوە و خواوەکیلی ، لە لای خۆیانەوە وشەی وایان داناوە شاعیر نەزانیویەتی و نەبیستویەتی، وە رەنگبێ ئەگەر خۆی لە ژیاندا بوایە بە هیچجۆر ماوەی نەدایە ئەو کەسانە بەو شێوە گوڵبژنی باخچەی شیعری بکەن [1] •

---

(١) مامۆستا گۆران کە لە ژیانی خۆیدا بەشـێك لە شـیعرەکانی بە چـاپ گەیشتۆن و ، خۆی پێشکەشی خوێندەوارانی کردۆن ، دوای ئـەوەی گۆران بە سەر شێواز و بیریدا هاتوە و گەلێ شێوەی شیعری گۆڕیوە و هەندێ رێبازی بۆ دواجار خواحافیزی لێکردوە ، ئامادە نەبوە هەڵسێ بژاری شیعرە کۆنەکانی لە وشەی بێگانە بکات و ، بە ئاشکرا زیانی ئەو =

ئەمانە بۆنەتە هۆی شاررانەوەی رۆی راستیٚ گەلیٚ شیعر و هۆنراوەی شاعیرەکانمان و خوێنەری دیوانی ئەو شاعیرانە هەست بە تام و چێژی بیری شاعیرەکە ناکا و زۆر جار ، لە باتی خۆشی بیرکردنەوە ، لە گەڵ پــەستیٚ و پەژارەدا رۆبەڕۆ ئەبیٚ •

بە رای من ، لە کاتێکدا هەندێ بیر و رای تایبەتی دەربارەی شیعری کلاسـیکیٚ بڵاو دەبێتــەوە (٢) • پەردەڕامالـین لە سـەر ئەو هــەڵە و ناڕێکییانــە و دەرخســتنی رۆی راســتیٚ ئەو دیوانانــە و نرخاندنی ئەو شـیعرانە و رێزگرتنی خاوەنــەکانیان ئــەرکێکی گەورەی ســەرشانی شارەزایان و ئەدەبدۆستانی کوردە و ، ئەم کارە تا دوا بکەوێ زیاتر گران ئەبیٚ و ، زیاتر مەترسی نەدۆزینەوەی رۆی راستیٚ مەبەست لە شیعرەکان پەرە دەسێنیٚ •

وەك وتمان دیوانی ( وەفاییٚ ) یەکێکە لەو دیوانانەی تا ئێستە چەند جار بە چاپ گەییون ، بەڵام دۆبارە بەداخەوە هەر جارێك گەلیٚ هەڵەو رای سەیری تێدا بڵاوکراوەتەوە • بــە کورتی بڵێین هیچ جارێك لــەو جارانە

---

=

کارەی بۆ خوێندەواران رۆنکردوەتەوە . (بڕوانە : بەهەشت و یادگار ، گۆران ، ل : ١٣ ، چاپیدوەم ، ١٩٧١ ) .

(٢) هەندێك لە خوێندەواران رایان وایە : کە شـیعری شـاعیرانی کۆنمان مردۆن و هــەل و مــەرجی ژیــانی هاوچەرخیـــان لەدەسداوە و خۆپێوەخەریككردنیان شتێکی زیادە و ، رەنجدان لە گەڵیان بیٚ هۆدەیە. لێرەدا ئەوەم بیرکەوتەوە رۆژێك چۆمە کتێبخانەی دەسگایەك لە دەسگا رۆشنبیرییە کوردیەکان و داوای دیوانێکی (وەفاییٚ)م کرد، لیٚپرسراوێکی کتێبخانەکە پاش هەندێ ئەم دیو و دیوکردنی کتێبــەکان و گەڕان بــە ناویاندا وتی : زۆر جێـگەی شانـازیمە کە دیـوانی شـاعیری وا لــە کتێبخانەکەماندا نیە !!

دەستێکی شارەزا و ئەمینی لەگەڵ نەبوە و ، هەوڵی ئەوەشی بۆ نەدراوە زیاتر شیعری وەفایی بدۆزرێتەوە و لەگەڵی چاپبکرێ ؛ بۆیە دەبینین دواچاپەکە هیچ جۆرە زیادە و جیاوازییەکی ئەوتۆی تێدانیە نرخێکی تایبەتی بە دیوانەکە بدا !

ماوەیەك لەمەوپێش دیوانێکی دەسخەتی (وەفایی)م دەست کەوت ، پاش هەندێك بەراورد لەگەڵ دیوانە چاپکراوەکاندا بۆم دەرکەوت کە ئەم دیوانە ـ دەسخەتە ـ نوسخەیەکی نایابە و بە چاکترین دیوانی وەفایی ئەژمێررێ ، کە تائێستە بەردەست کەوتبێ • بۆیە پیشانی چەند مامۆستای شارەزا و ئەدەبدۆستم دا کە یەك بەیەك زیاتر نرخی ئەو دیوانەیان رۆنئەکردەوە و بایەخی زیاتریان ئەدایە و ، هەموّش تێکڕا رایان وابۆ کە سەرانسەری ئەو دیوانە جارێکی تر چاپ بکرێتەوە • منیش لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە راکانیانم پەسەند کرد :

١ـ ئەم دەسخەتە (٣٨) پارچە شیعری کوردی و (٩٢) پارچە شیعری فارسی تێدایە کە تا ئێستا بە چاپ نەگەییون •

٢ـ بە نیسبەت ئەو شیعرانەوە کە تا ئێستە بڵاوکراونەتەوە ئەتوانرێ لە رۆی ئەم دیوانەوە تا ئەندازەیەکی زۆر رۆی راستییان بدۆزرێتەوە و لەو هەڵە و نارێکییانەی تیایاندان رزگار بکرێن •

٣ـ ئەم کارەی من پاڵپشت و یاریدەر ئەبێ بۆ هەوڵ و تەقالایەك لەمەولا لەگەڵ شیعرەکانی وفاییدا بدرێت ، چونکە بێگومان ئەم کارەی من دوا هەنگاوی ساخکردنەوەی شیعری وەفایی نیە و رەنگە رۆژانی داهاتو گەلێ هۆنراوە و رۆداوی بە کەڵکمان دەربارەی وەفایی بۆ دەربخەن کە تا ئێستە هیچ تیشك و تروسکەیەکیان لە ئاسۆوە دیار نیە •

**ڕێبازم لە نوسینەوەی دیوانەکەدا :**

١ــ نوسخەکەی لای خۆم بە ئەصڵ داناوە و ، بە گوێرەی توانا هەوڵم بۆ ساخکردنەوەی داوە و گۆڕیومەتە سەر ڕێنوسی ئێستای کوردیَ •

٢ــ بە داخەوە چاپەکانی پێشوَ گەلێك جێگەی گومانن و ، بۆ ئەوە نەشیان بە نوسخە دابنرێن و ، بۆ لێکۆڵینەوە بەراوردیان لەگەڵ بکرێ و ، گەلێکیش هەوڵم دا ئەو کەشکۆڵ و دەسخەتانەی چاپەکانی پێشوَیان لەبەر هەڵگیراوەتەوە بەدەس بهێنم ، بەڵام هەوڵەکانم بێ سوَد بوَن[٣] ، لەگەڵ ئەوەشــدا هەندێ جار لــە ساخکردنەوەی بەشـــی بڵاوکراوەدا ســوَدم لێوەرگرتوَن و جــاری وەهاش بوە وشەیەك ، یــان نیوە شــیعرێکم لێ وەرگرتوَن و لە پەراوێزەوە ئیشارەم بۆ کردوە[٤] •

٣ــ ئەگەر شیعرێك لە چاپەکاندا هەبێ و لای من دەست نەکەوتبێ لە شوێنی خۆیدا نوَسیومە و باسم لێ کردوە •

٤ــ هەر شیعرێك ــ لە بەشی بڵاوکراوەدا ــ لە دەسخەتەکەی لای مندا بێ و لە چاپەکاندا نەبێ لە نێو دوَ کەوانەی ئاوادا [ ] دامناوە •

٥ــ لە بەر ئەوەی شیعری کلاسیکیَ هەر شیعرە بۆ خۆی مەعنایەك ئەبەخشێ ئیشارەم بۆ جیاوازیَ پاش و پێش کەمتر کردوە •

٦ــ زۆرم مەبەست بوَ مانای شـــیعرەکان لێك‌بدەمەوە ، بەڵام پاش

---

(٣) ئەم هەوڵ و کوَششەم بە راز و گلەییەك لە گەڵ ماموَســتا گیودا باس ئــەکەم .

(٤) پەنا بردنم بۆ لای دیوانە چاپەکان وەك شتێکی ناچاری وایە ، چونکە وەك لەمەولا باسی ئەکەم ، دەسخەتەکەی خۆم شــڕ و دڵوَپەلێدراو و پەرپوَتە .

هەندێك هەڵسەنگاندن و خەریك بۆنیان بۆم دەرکەوت ئەم کارە لە توانای مندا نیە ؛ ئەمەیش لە بەر چەند هۆیەك ، لە سەروی هەمۆیانەوە وەفایی صۆفی مەشرەب بوە و شیعرەکانیشی بە زۆری رواڵەتی ئەوینداریییان پێوەیە و رایەکیش لە سەر ئەوەیە کە ئەو هەمو رواڵەتە ئەوینییەش هەر لە چاوگەی تەصەووفەوەیە و وەفایی شیعری ئەوینی نیە ٠

زیاد لەمەش گەلێ زاراوە و ناوی شتومەکی وای بەکار هێناوە لە زۆر ئەدیب و خوێندەواری ئێستە یاخی ئەبن ٠ جا من لێرەدا بەو پەڕی ئەمانەتەوە پێ لە نەزانینی خۆم ئەنێم و بارێك بزانم بۆم بار ناکرێ لە سەرەتاوە خۆمی پێوە ماندو ناکەم [٥] ٠

٧ـ هەندێك وردە تێبینی پێویست بەرانبەر بە نوسینەوەی دیوانەکە هەیە لەم خاڵانەی خوارەوەدا دیاریيان ئەکەین :

أ ــ نوسەری دەسخەتەکە گەلێ جار ( دامان )ی بە ( دمان ) نوسیوە ، ئێمە ئەو جێگایانەمان راست کردوەتەوە ٠ هەندێ جاریش لە پەراوێزدا باسمان کردوە ٠

ب ــ لە دەسخەتەکەدا (نرکس) نوسراوە کە هەڵئەگرێ ( نەرگس ) بێ ، بەڵام پاش ئەوەی لە مامۆستا هێمن و چەند کەسی کەم پرسی و تێکڕا ئەوەیان سەلماند کە لە شێوەی موکریدا ( نێرگس ) ئەڵێن نەك ( نەرگس ) پەیڕەوی ئەو رێبازەم کرد و هەموم بە ( نێرگس ) نوسی ٠ هەر بەم پێیەش لە سەر نوسینی ( روح ) نەك ( رۆح ) و ( کوتم ) نەك (گوتم) رۆیشتوم ،

---

(٥) کە ئەڵێم : مانای شیعرەکانی وەفایی نازانم ... مەبەستم ئەوە نیە کە هەر هیچیان لێ نازانم ، بەڵکو رەنگە مانای بەشی زۆری ئەو شیعرانە بزانم و بتوانم باسیان لێ بکەم و لێیان بکۆڵمەوە ؛ بەڵام هێشتا ئەوەی کە مانای نازانم هەر زۆرە و باری لێکۆڵینەوەی پێویستی بە گەلێ لێ زانین و پسپۆڕێ ئەبێ و بە پرسیار و یارمەتی ئەم و ئەویش ناگاتە ئەنجام.

ئەگەر شتێك وا نەبێ لـەبیر کراوە ٠

ج ــ نوسەر هەندێ جار ( ئایینــە ) و هەندێ جاریش ( ئاوینــە )ی نوسیوە ئێمە ( ئاوێنەمان ) پەسەند کردوە ٠

د ــ نوسەر گەلێ جار هەڵەی کردوە و زۆر جاریش نوختە و شتی وای لەبیر کردوە ، ئەوەی هەڵەکە زۆر رون بێ و شتەکەش بچوك بێ ؛ وەك نوختە باسم لێ نەکردوە ، بۆ ئەوانی تر لە پەراوێزەوە باسم کردوە ٠

هـ ــ هەر وشەیەك ، یان جێگەیەك لە دەسخەتەکەدا بە باشی بۆم رون نەبوبێتەوە بە گومانەوە نوسیومە و لە ناو دو کەوانەی [ ! ] ئاوادا دامناوە٠

و ــ گەلێ جار ( ببینم ) ی بە ( بە بینم ) نوسیوە ، ئێمە بەلامانەوە هەڵە بوە و چاکمان کردوە ٠

ز ــ چەند پارچە شیعر سەرەتاکانیان وەك ناتەواو دەرئەکەوێ ؛ بەم شێوە کە کۆتایی هەردو نیوەی شیعری یەکەمی ئەو چەند پارچە وەك یەك نین، کە ئەمەش لە شیعری کۆندا بە تەواو ناژمێررێت، بەلام جێگاکان لە یەك و دو بە دەرن ، بۆیە رەنگە شاعیر خۆی ئەو کارەی کردبێ ٠

**هەوڵ و کۆششم بۆ ساخکردنەوەی ئـەم دیوانە :**

باری ئاڵۆزێ و ناهەمواریێ رێنوسی کۆنی کوردێ ــ کە لە راستیدا دروست نیە بەو رێنوسە بوترێ ( رێنوسی کوردێ ) ؛ چونکە یان رێنوسی عەرەبێ یان رێنوسی فارسییە ــ لە خوێندەوارانی کورد شاراوە نیە و هەر خوێندەوارەی یـەك دو جار چاوی بە دو ســێ لاپەڕە دەسنوسی کوردێ ٤٠ ــ ٥٠ ساڵ لەمەوبەر کەوتبێ ئەزانێ کە چەند بە زەحمەت باری راستێ مەبەست لە شیعرێــك یان پــارچە شیعرێك ئەدۆزرێتەوە و لەناو چەند جۆر ئیحتیمالدا ئیحتیمالێك هەڵئەبژێرێ ؛ چونکە کاتی وا هەیە تەنها وشەیەك ،

بەو ڕێنوسە نوسرابێ ، چەند بار خوێندنەوە هەڵئەگرێ و ، خوێنەر ئەبێ بە کۆشش و زیرەکێ خۆی یەکێکیان هەڵبژێرێ • بۆ نمونە ئەگەر لە شوێنێکدا بنوسرێ (کل) هەڵئەگرێ « گوڵ ، گڵ ، گەڵ ، کل ، کول ، کەل ، کەڵ ، کوڵ ، کڵ » ئەوەندە بارەی لێ بدوزرێتەوە ئەوسا یەکێکیان هەڵبژێرێ •

منیش کە ئەم دەسخەتەی دیوانی ( وەفایێ )م دەس کەوت ، جگە لە شڕێ و دڵۆپە لێدراوێ و پەرپوتێ پەڕەکانی ، ئەم قورتە گەورەم لەپێش بو کە ئەبێ ئەو ڕێنوسە کۆنە بە ڕێنوسی کوردێ ئێستە بگۆڕم و ئەم دیوانە پێشکەشی خوێندەواران بکەم • لە خوێندەوارانیش شاراوە نیە کە ئەگەر دوێ سێ نوسخەی جۆراو جۆری دیوانێك دەست بکەون باری ئەم ئەرکە تا ئەندازەیەك ئاسانتر ئەبێ ، بۆیە منیش هەر لە سەرەتاوە چەندێك دەنگم ڕۆیی و مەچەکم چەرخا هەوڵم بۆ بەدەسهێنانی نوسخەی تری دیوانی ( وەفایێ )دا ، بەڵام شتێکی ئەوتۆم دەس گیر نەبو •

لێرەدا ئەوە دێتە پێش کە خوێنەرێك بڵێت: خۆ مامۆستا گیو* موکریانێ

---

* ئەم پێشەکییە کاتێك نوسراوە خوالێخۆشبو مامۆستا گیو کۆچی دوایی نەکردبو و بە هیوای ئەوەبوم بەم چاپەتازەی دیوانی وەفایێ چاوی ڕون ببێتەوە و ، وەڵامی ئەم ڕازوگلەییەیش لە خۆیەوە ببیستم ، بەڵام بە داخەوە مەرگ مۆڵەتی نەدا •

دوای لە جیهان دەرچونی ئەویش هەندێ دوڵ بوم لە بڵاوکردنەوەی ئەم پێشەکییەدا بێ دەسکارێ • بە هەر حاڵ ئێستە کە بڵاوی دەکەمەوە جگە لە دەرخستنی ڕاستێ و خزمەتی ئەدەبی کوردێ هیچ مەبەستێکی ترم نییەو ، خوالێ خۆش بو جێگەی ڕێزی هەمووانە و هیچ کەسیش بێ هەڵە نابێ و ڕۆژانی داهاتویش زیاتر کارەکانی مامۆستای کۆچ کردو ڕون دەکەنەوە و ، لێکۆڵینەوەی پسپۆر و خوێندەوارانیش جێگە و مەکانەتی ڕاست و دروستی مامۆستا گیو دیاری دەکات و هەوڵ و کۆششە پیرۆزەکانیشی بە ورشەدارێ لەسەر لاپەڕەکانی مێژوی ئەدەبێ ڕێگەرونکەرەوەی نەوەکانی ئێستە و داهاتوی گەلی کورد دەبن و گیانی خزمەتگوزارێ و کۆڵنەدانی مامۆستای نەمریش هاندەری هەمیشەیێ

=

سێ جار دیوانی وەفایێ چاپکردوە ، بـۆ داوات لێ نەکرد دەسخەتەکانی خۆیت بداتێ ؟ بەڵێ لە راستیدا ئەمە وایە و ، هەر ئەم پرسیارەشە روبەڕۆی مامۆستا گیوم ئەکاتەوە کە راز و گلەییەکی لە گەڵ بکەم ، کە ئـەگەر زۆر ناچار نەبوایەم خۆم لێ ئەپاراست :

پاش ئەوەی گەلێ هەوڵم دا و هیچ ! هەڵسام نامەیەکی دوور و درێژم بۆ مامۆستا گیو نوسی و ، باس و نیازی دڵی خۆم هەرچی هەبو بۆم نوسی ، تەنانەت نوسیم : مامۆستا تۆ خۆت دەزانی گەلێ کەس باسـی جەنابت وا دەکەن کە دەسکارێ شـیعری شاعیران بکەیت و گەلێ شـت بگۆڕی ، یەکێکیش لەو دیوانانە کە جەنابت چاپت کردوە دیوانی وەفاییە ، وە ئێستا منیش لە بەر دەسخەتێکی کۆندا ئەینوسمەوە و بە هیوام چاپی بکەمەوە ئەگەر بێت و دەسخەتەکانی خۆتم بۆ بنێریت و لەم روەوە یارمەتیم بدەیت ئەوا من وێنە و نوسخەیان بڵاو ئەکەمەوە و یارمەتیدەری تـۆ ئەبم بۆ چەسپاندنی راکانت و سەلماندنی چاپەکانی پێشو ، خۆ ئەگەر بۆیشم نەنێری ئەوا من ڕێوڕاست نوسخەکەی خۆم بڵاو ئەکەمەوە و جیاوازێ کارەکەی تۆ ـــ کە ئەگەر وەك خوێندەواران ئەڵێن وابێ ـــ لە خوێندەواران زیاتر ئاشـکرا ئەبێ و قسەیان سوار ئەبێ . خـوا هەڵناگرێ زۆرم چاوەڕوان کرد دیسان هیچ ! جارێ تر هەڵسام دۆستی خۆشەویستم مامۆستا شێخ عەبدولڕەحمان عەبدولکەریم بەرزنجێ ، کە لە هەولێر دائەنیشێ ، بۆ ئەم مەبەستە راسپاردە لای مامۆستا گیو ، وەلامی ئەویشی بەو شێوە دابوەوە :

کە هیچ دەسخەتی وەفایێ نیە و ئەگەر ( من ) دەسـخەتەکەی خۆمی بدەمێ ئەوا ئەو چاپی ئەکات و چەند نوسخەم ئەداتێ ! بەمەشەوە نەوەستام لە هاوینی ١٩٧٥ دا بیستم مامۆستا گیو هاتوە بۆ بەغدا گەلێکی بە شوێندا گەڕام بەلام نەمتوانی ببینم ، بۆیە پەنام بردە بەر مامۆستا ( هێمن ) بەڵکو

---

=

**لاوانی خوێندەوار و ئەدەبدۆستی کورد دەبێ .**
**ڕێزو سلاوم بۆ گیانی پاکی مامۆستا گیوی نەمر .**
**حەقدە**

ئەو شتێکم بۆ بکات ، دوای ئەوەیش مامۆســتا هێمن مەبەستەکەی بــۆ شیکردبووەوە و داوای دەسخەتەکانی لێ کردبێ بەم جۆرە وەڵامی دابووەوە : کە دەسخەتی ( وەفایێ ) هیچ نیــە و نەبوە ، ئەوەندە هــەیە کاتی خــۆی شیعرەکانی ( وەفایێ )ی لە دەمی بێکێکی وەفایێ بیستوە کە ئــەو بێکە هاتوەتە هەولێر و هەمێ دیوانی وەفایێ لەبــەر بوە ! تەنها لێرەدا ئەوەندە ئەڵێم : ئایا ئەگەر کورد ــ لەم سەردەمەدا ــ ئافرەتی ئاوای ببوایە نەئەناسرا ؟ دێبارە ئایا شایانی چەند پەیکەر و باس و رێز نەئەبێ ؟! بە کورتی ئەویشم هیچ و هیچ !! بۆیە ئاخری کۆڵ و بارم خست و هاتمەوە بۆ لای دەسخەتە بۆری خۆم و یارمەتێ بەرێزان : مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەرێس و مامۆستا هێمن کە بە راستی ئەگەر ئەوان ئەو یارمەتییە گەورەیان نەدایەم لە توانامدا نەبێ ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنم • زیاد لەوەی کە هەردێلایان چاك شارەزای ئەدەبی فارسێ و رێنێسی کۆنن مامۆستا هێمن بــۆ باری رێکی لەهجەی موکرێ ــ کە وەفایێ شیعری پێ وتوە ــ یارمەتیەکی زۆری دام ، تەنها پاداشێکم بۆیان هیوای تەمەندرێژێ و لەشساغییانە کە بــەمە زیاتر خزمەتی ئەدەبی کوردێ دەکەن • لێرەدا ئەوە لەبیر ناکەم کە مامۆستا محەمەد مستەفا ( حەمە بۆر = هۆشەنگ ) هەرچی پێ کرا لە یارمەتیم درێغی نەکرد و چەند دەفتەری دەسخەتی مامۆستا ( نەجمەدین مەلا )ی خستە بەردەستم کە گەلێ سێدم لێوەرگرتن و لە پەراوێزەوە بە (ح) ئیشارەم بۆکردن •

**لە نێوان مامۆستایان گیو و ســەیدیاندا :**

ئەوەی راستی بێ لە سەرەتاوە نەمئەویست باس لە ناوەرۆکی چاپەکانی مامۆستایان گیو و سەیدیان بکەم ؛ چونکە ئەمزانی بەم کارە لای ئەو دێ مامۆستایە زیاتر رەزام گران ئەبێ و برینیان ئەکولێنەوە ، بەڵام بە ناچارێ خۆم لە ناو کرۆکی ئەم مەبەســتەدا دی ، لەبەر ئەوەی وەڵامی پرســیاری خوێندەواران لە سەر پرسیاری رەوایان بدەمەوە ؛ چونکە هەر خوێنەرێك

بۆی هەیە بلێ : تۆ ئەو چاپانەی مامۆستایان گیو و سەیدیانت بۆ نەکردوە بە سەرچاوە ؟ بەڵێ ئەم پرسیارە زۆر رەوایە و سەبارەت بـە مامۆستا گیو وەڵامم دایەوە • هەرچیش وەکو مامۆستا مەلا محەمەد ئەمینی سەیدیان ، ئەوە ناشارمەوە کە یەکەم جار چاوم بە پێشەکییە دوور و درێژەکەی کەوت وتم : رەنگە کارێکی باشی کردبێ و منیش سوودی باشتری لێ وەرئەگرم •• بەم هیوایەوە پێشەکییەکەیم خوێندەوە ، کە گەیشتمە باسی ئەوەی مامۆستا سەیدیان ئەم جارە دیوانی وەفایی لە بەر دوو دەسخەتی باش چاپکردوە کە نوسخەکانی : میرزا عەبدولڕەحمانی رەزگەیی و سەید بەهائەدینی سەدرییە ( ل : ١٣ ) وتم : دوور نیە ئەم چاپە زۆر زۆر باش بێ ، بەڵام زۆری پێ نەچو بە نائومێدی دەسبەردار بووم و دەستێکم کەوتە ئەملا و دەستێکم ئەولا ! چونکە یەکەم شتێك کردم ئەوە بوو هاتم چاپەکانی مامۆستا گیو و مامۆستا سەیدیانم شیعر بە شیعر ژمارد و بەراوردێکی وردم کردن ، بـەڵام ئەنجام چیم دەسـتکەوت ؟ ئەنجامێکی دڵتەزین و ماندوبوونێکی بێسـوود ، ئەو ئەنجامەش ئەوەیە : مامۆستای سەیدیان لە لاپەڕە (٨٢)دا چوار شیعری لە چاپـەکەی مامۆسـتا گیو قرتانـدوە ، هـەروەها لە لاپـەڕە ( ١٥٤ )دا پێنجخشتەکیەکی قرتاندوە و چەند نموونەیتر • بۆبەشی کەمی • بۆ زیادەیش لە لاپەڕە (١٣١)دا دوو شـیعری زیاد کردوە و لە (١٣٧)دا یەك شـیعر و لە (١٧٣)دا یەك شیعر و لە (١٧٤)دا دوو پێنجخشتەکی ••• بەڵام لێرەدا ئەوە ناشارمەوە کە رای زۆرم لەسـەر ئەوەیە مامۆستای سـەیدیان خۆی ئەم شیعرانەی زیاد کردوە ئەم رایەشم بە دوو بەڵگە بە هێز ئەکەم •

بەڵگەی یەکەم ئەوەیە : هیچ کام لەو شیعرانەی لای سەیدیان زیادن لە نوسخەکەی لای مندا نیە ، ئەمەش ، زیاد لەوەی نوسخەکەی من ناتەواوی کەمە ، بڕوا ناکرێ لە چوار پێنج جێگە جیاوازیدا دوو نوسخە جارێك یەك نەکەون ! سەرەڕای ئەمانەش سەیدیان هیچ دەسنیشـانێکی جێگەی ئەم

زیادانەی نەکردوە و باسی سەرچاوەیانی نەکردوە •

بەڵگەی دوەهەم ئەوەیـــە : یەکێك لەو شیعرانەی کە زیـــادی کردوَن شیعرێکە سەرەتای پارچەیەکی پێ تەواوکراوە ، کە لە راستیدا ئەو پارچە و پارچەی دوای ئەو یەك پارچەن و بە هەڵە لای هەردوَ ماموّستا کراون بەیەك، ئەمەش ئەو شـــیعرەیە :

« دەردی دوَریت کوشتمی ، چاوم ئەوە ســـەودا نیە »[٦]
« روَت وە دەرخە زولفەکەت لادا شـــەوی یەلدا نیـــە » •

وەك بەڵگەیەکی تر و ئەوەش نابێ پشـــت گوێ بخرێ دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەر لە چاپی سەیدیاندا هەیە ئەویش ئەوەیە : کە لـــە چاپەکانی یەکەم و دوَهەمی هەولێردا چـــەند جێگە بە بوّشی ماونەتەوە ماموّســـتای سەیدیان هاتوە ، دوَبارە بێ هیچ باسێك لە سەرچاوە ، ئـــەو بوّشاییانەی پڕکردوەتەوە ، لەمەیش سەیرتر ئەوەیە کە ماموّستا گیویش شوێن ماموّستای سەیدیان کەوتوە و لەبەر نوسخەکەی سەیدیان بوّشاییەکانی پڕکردوەتەوە • وەك ماموّستا گیو خوّی دەڵێ : « ••• بەرگێکم لە دیوانی وەفایی چاپی کوێستانی دەست کەوت ئەو شوێنانەی کە ســـاخ نەکرابوَنەوە لە بەشـــە چاپنەکراوەکەی لای خوّمدا رێك و پوخت کرانەوە • ( ل : ١٢٥ ، چاپی : ٣ ، هەولێر ) • »

جارێکی تریش رای تەواوم ئەوەیە کە ماموّستای سەیدیان خوّی ئەم بوّشاییانەی پڕکردوەتەوە ؛ چونکە لە نوسخەکەی مندا ئەو جێگایانە بـــە تەواوی هەن و هیچ جێگایەکیان لەوانە ناچێ کە سەیدیان نوَسیونی ، زیاد لەوەی کە ئەو وشانەی زیادی کردوَن هیچ لەگەڵ جێگاکاندا ناگونجێن و ماناکانیان نازێکە و ، وەك پینەی رەش لە جلی سپیدا هەر بە یەکەم سەرنج

---

(٦) بڕوانە : دیوانی وەفایی ، ل : ١٣٧ ، چاپی مەهاباد .

ئاشکرا ئـەبن ! بۆ نموونە ئەم شـیعرەی خوارەوە بخوێنەرەوە و لـەگەڵ ئەسڵەکەدا بەراوردی بکە :

**« بـە یادی رۆم دەڵێ بگریێ بـە چاوم گەر ئیشارەت کا .**
**دەگرییێنێ مەلەك پاکی لە عـەرش و فەرش و ئەملاکـە » .**

( فەرش و ئەفلاکە . چاپی سەیدیان )

( بڕوانـە : ل : ٨٥ ی چاپی هەولێر و ، ل : ١١٨ ی چاپی مـەهاباد هەروەها ل : ٨٥ ی چاپی یەك و دوێ هەولێر کە لە « بەچاوم »ەوە بە بۆشی ماوەتەوە . ) دوایی شیعرەکە بە راستێ بخوێنەرەوە وەك لە دەسخەتەکەی لای مندایـە :

**« بـە یادی رۆم دەڵێ بگریێ بلا چاوم لـە گریەت بێ**
**بـەهاران نمنمی باران بە مەیخواران طەرەبناکە » (٧)**

وە هەر جێگەیەکی تر لەو بۆشاییە ( پڕکراوانە ! ) بگری لەم جێگە باشتر نیە و حاڵی لەمە خۆشتر و مانای لەمە رێکتر نیە .

بە پێویستی ئەزانم ئاوڕێکی تر بە لای چاپەکەی سەیدیاندا بدەمەوە و ئەوەندە بڵێم : مامۆستای سەیدیان ئەڵێ : «وە بۆ غەڵەت گیری و تەواوکردنی دیوانەکەش سێ ٣ کاری بە نرخم کرد و بەجێم هێنا » .

« الف ــ دوو نووسراوەوەی کۆنەم وە دەس خست : »

« ١ــ نووسراوەی برام مـیرزا عەبدورڕەحمانی ( رەزگەیێ ) سابلاخێ دەسخەتی سـاڵی ١٣١٨ بە خەتی خوالێخۆش بوو مـیرزا عەلی رەزگەیێ باوکی . »

« ٢ــ نووسـراوەی سەید بەهائەددینی سـەدریێ ساداتی دانیشتووی ( خانێ ) نوسراوەوەی ساڵی ١٣٢٢ .. » ( ل : ١٣ چاپی سەیدیان . )

---

(٧) بڕوانە : دیوانی وەفایێ ، ( دەسخەت ) ل : ٨٥ .

یەکێك ئەم سەرەتایە بخوێنێتەوە بڕوای بەوە ئەبێ کە ئەم مامۆستایە کارێکی یەکجار بایەخداری کردوە و لێکۆڵینەوەیەکی زانستێ بە ئەنجام گەیاندوە ، بەلام هەمدیس بە داخەوە کە ئەگەینەوە لای چاپەکە حەپەسان و سەرسامێ و هەناسە ساردێ زیاتر هیچ شتێك نابەسینەوە ؛ چونکە وەك لەپێشەوە باسمان کرد هەمێ ئاڵ و گۆڕ و جیاوازییەکی ئەم ( لێکۆڵینەوە تازەیە ! ) بریتییە لەو چەند شیعرە بۆ وەفایێ هەڵبەستراوە و ، کۆمەڵە هەڵەیەکی تازە کە کەوتوەتە ناو چاپەکە • ئەگینا لە سەرانسەری دیوانەکەدا پەراوێزێك نابینی بڵێ : ئەم جێگە راستکرایەوە ، یان نوسخەی فلان وا ئەڵێ ، زیاد لەوەیش چاپەکەی مامۆستا گیو دانراوە بێ پاش و پێش و ئاڵ و گۆڕ لە بەری چاپ کراوەتەوە و تەنانەت لە چاپەکانی هەولێردا ، بە هەڵە ، پارچەیەکی پیتی (تێ) پێش پارچەکەی پیتی (بێ) خراوە کەچی مامۆستا سەیدیان ئەو هەڵەیشی بە سەردا تێپەڕیوە و بۆی راستنەکراوەتەوە • جگە لەوەی پارچەیەکی ( نالێ ) لای گیو چاپ کراوە سەیدیانیش پێی نەزانیوە هەروەها پارچەیەکی (کوردێ) : «چێشتم ئەمڕۆژەهری •••» بەڵێ ئەوەندە جیاوازێ تر هەیە پەنجە بۆ راکێشانی پێویستە ئەوەیش ئەوەیە : کە ژمارەی لاپەڕەکان و جێگای پارچە شیعرەکان الای سەیدیان گۆڕاوە کە ئەبو ــ مادام مەسەلەکە هەر لاسایی‌کردنەوەیە و بەس ! ــ ئەو جیاوازییەیش نەبوایە !! چونکە گیو بە سێ جار چاپ‌کردنەوە هێشتا ژمارەی لاپەڕەکان و جێگەی شیعرەکانی نەگۆڕیوە ، بەم شێوە کە پارچە شیعرێك ئەگەر لە چاپی یەکەمدا لە لاپەڕە ٨٥دا بێت هەر ئەو پارچە شیعرە لە لاپەڕە ٨٥ی چاپی سێهەمدا جێگەی خۆی نادۆڕێنێ ! بۆ نمونە بڕوانە پارچە شیعری :

**« دەمێکی هەستە پێ قوربان جمالت عالم ئاراکە ••• »**

چاپی یەك و دۆ و سێی هەولێر •

خوێنەری بەڕێز ! نامەوێ لەم ئەندازە زیاتر لەسەر ئەم باسە بڕۆم ؛

چونکە « ئەم هەویرە ئاو زۆر ئەبات» و تەنها مەبەستم ئەوەیە کە بزانی ئەو چاپانە جێگەی متمانە نین و هەوڵ لەگەڵدانیان خۆماندوکردنی خۆڕاییە• هەر ئەمەشە وای لیێ کردم ئەو چاپانە پشت گوێ بخەم و لە کاتی زۆر ناچاریدا نەبێ هیچیان لێ وەرنەگرم • ئەوەش لە خوێنەر ناشارمەوە کە جارێك سەرلەبەری دیوانی وەفاییم بە بەراوردکراوێ لەگەڵ چاپەکاندا نوسییەوە بەلاّم ئەم بێ متمانەییە ئەوەی پێ کردم کە دەستم لەو ئەرکە زۆرە هەلگرت و هاتم جارێکی تر لەبەر دیوانەکەی خۆم ، بێ بەراوردکردن ، سەر لەبەر نوسیمەوە •

## وەسفێکی دەسخەتەکەی دیوانی وەفایێ :

وا لە خوارەوە باسێکی ئەو دەسخەتە ئەکەم کە کردومە بە بنچی لێکۆڵینەوەی دیوانی وەفایێ و پشتم پێ بەستوە :

١ـ بە یەکەم چاوپیاخشاندن ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەم دەسخەتە سەرەتا و کۆتایی نەماوە ، ئەمەش ئەبێتە نیشانەی ئەوەی کە تەواوێ هۆنراوەکانی وەفایێ تا ئێستە بە دەست نەهاتوە و ، نازانرێ کێ ئەم دەسخەتەی نوسیوەتەوە و ، لە کوێ و ، لە چ کاتێکدا نوسراوەتەوە ••• ئەمانەش هەر یەکەیان گەلێ سود و بەلگەی بە نرخی بە دەستەوە ئەدا و ڕوی لێکۆڵینەوەی زۆر شتی بە دەستەوە ئەدا ، کە ئێستە هەمویان لەکیس چون •

٢ـ دەسخەتەکە دو بەشە :

بەشی یەکەم بەشی فارسیێ :

ئەم بەشە (٦٧) لاپەڕەیە هیچ کۆتایی دەس نیشان نەکراوە ، تەنها ئەوەندە هەیە لاپەڕەیەك بە سپێتی ماوەتەوە و ، دوایی بە خەتێکی تر لە

نیوەی ئەو لاپەڕەدا پارچەیەك شیعری (خاقانی) نوسراوەتەوە • هەر لەو لاپەڕەیەدا بە قەڵەمی (ڕەصاص) مێژویەکی ساڵی (٩٢٠) نوسراوە ، بەلاّم ئەم مێژوە دوای نوسینەوەی دیوانەکە نوسراوە •

بەشی دوهەم : **بەشی کوردی**

ئەم بەشە بە پارچەی :

**« ئەی خۆش خەبەر ، نەسیمی سەحەر ، پەیکی عاشقان »**

دەست پێ ئەکات کە تا ئێستە بلاّونەکراوەتەوە • بەشی کوردیش (١٠٢) لاپەڕەیە و کۆتایی نەماوە و ناوی کەسی پێوە نیە •

٣ــ دەسخەتەکە کۆن دیارە و بە تەخمین و بەراورد لەوە ئەچێ تەمەنی لە ٧٠ ساڵێك کەمتر نەبێ ، باشیش هەڵنەگیراوە ، بۆیە ئاو و دڵۆپەی زۆری بەرکەوتوە و گەلێکی کۆژاوەتەوە و ڕەش بوەتەوە و زۆر بە زەحمەت و کێشە ئەخوێنرێتەوە •

٤ــ پانایی لاپەڕەی ئەو کاغەزەی تیا نوسراوەتەوە (١١) سانتیمەترە ، درێژییەکەیشی (١٩) سانتیمەترە ، ژمارەی شیعری لاپەڕەکان وەکو یەك نییە • لە بەشی فارسییەکەیدا لە دو جێگەدا پەڕە ــ یان زیاتر ــی کەوتوە •

٥ــ نوسەرەکەی لە کاتی نوسینەوەیدا ــ بە پێچەوانەی هەندێك لە دەسخەتەکانی تر ــ هیچ جێگەیەکی ، من پێ بزانم ، لە شێوەی قسەو گفتوگۆی موکری نەگۆڕیوە • ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ نوسەرەکە یان موکری بوە ، یان زۆر بە ئەمانەتەوە شیعرەکانی نوسیوەتەوە •

٦ــ شایانی باسە نوسەر پەیڕەوی یاسای کۆنی لە نوسینەوەدا نەکردوە، بەم پێیە بە گوێرەی پیتەکانی هیجا غەزەلەکان بنوسێتەوە • بەڵکو ئەو

پەیڕەوی شێوەیەکی تایبەتی کردوە ، کە گومان بە خوێنەر پەیدا ئەکات کە بڵێ رەنگە دیوانەکە لەبەر دەستنوسی وەفایی نوسرابێتەوە و پەیڕەوی (تەرتیبی زەمەنی) یان شێوەیەکی تایبەتی کرابێ • بە تایبەتی کاتێ ئەوە بزانرێ ــ وەك مامۆستا هێمن ئەڵێ ــ زۆر باوە ئەو غەزەلەی لەم دەسخەتەدا دوا پارچەیە دواغەزەلی وەفاییە و وەفایی دوای ئەوە چوە بۆ سەفەری حەج و لەوێ کۆچی دوایی کردوە و نەگەڕاوەتەوە •

ئەم ڕێبازەی نوسەر و ئەم باسە وایان کرد کە لەبەر ئەو گومانە پێرستێکی تایبەتی بە گوێرەی دەستنوسەکە بنوسم و پێشکەشی خوێنەرانی بکەم تا زنجیرەی پارچە شیعرەکانی دیوانەکەیان لەبەر دەستا بێت و لەبەر ڕۆشنایی ئەو تەرتیبەدا بتوانن لە هەندێ باری شیعرەکان بگەن ، یان لێکۆڵینەوەیان پێشکەشی ئەدەبی کوردی و خوێندەواران بکەن •

هەرچەند ئەم دەسخەتە هەندێ کەم و کوڕی تێدایە و هەمو شیعرەکانی وەفایی تێدا نیە ، ئەوە نابێ بە هۆی ئەوە نرخی (وەك دایکی هەمو دەسخەتەکانی وەفایی) کەم بێتەوە و بە چاوێکی کەم سەیری بکرێ ، بەڵکو ئێستا و تا کاتێ دەسخەتێکی لەم باشتر سەر هەڵئەدا بە یەکەم سەرچاوەی باوەڕپێکراوی دیوانی وەفایی ئەزانرێ و هەمیشە ئەبێ بۆ گومانبڕی و هەڵەراستکردنەوە بۆ الای بگەڕێینەوە •

٧ــ پاش خوێندنەوە و پێداچونەوەیەکی ورد جارێکی تر مەبەستێکی گرنگ لە کاری نوسەری دەسخەتەکەدا جێگەی سەرنج و لێکۆڵینەوەیە ، ئەو مەبەستەش : هەوڵدانی نوسەرە بۆ بەکارهێنان ــ یان باشتر بڵێین دۆزینەوە ــ ی ڕێنوسێکی کوردی ، هەرچەند سەرەتای دەستنوسەکە نەماوە و ، هیچ باسێکیش لەم مەبەستە نەکراوە و ، مێژوی نوسینەوەی دیوانەکەیش نازانرێ ، وەك باسمان کرد دەستنوسەکە بێگومان لە (٦٠) ساڵ زیاتر لەمەوبەر نوسراوەتەوە ، کە بەراوردی ئەم دەستنوسە لەگەڵ

دەستوسێکی کوردیێ هاوتەمەنی خۆیـا دەکەین ، گەلێ هەوڵ و تەقالای ڕێنوسی کوردیێ لە ناو دێرەکانی ئەمدا بەدی ئەکەین کە لە ناو دەستوسە هاوتەمەنەکانیدا سەرەتایان دیـار نیە ؛ وەك :

١ـ زۆر روونە نوسەر لە گەلێ جێگەدا هەوڵی داوە جیاوازیێ لە نێوان لامی قەڵەو و لامی بچوکدا بدۆزێتەوە ؛ بەڵام بە بیری خـۆی جـگە لـە بەکارهێنانی پیتی ( ض ) لە باتی لامی قەڵەو ڕێگەیەکی تری بۆ چارەسەری ئەم مەسەلە نەدۆزیوەتەوە ؛ بۆ نمونە لە باتی (دڵ)، (دض) و لە باتی (قۆڵ) ، ( قوض ) و لە باتی (سڵ) ، (سض) و لە باتی (خەمڵیـوە) ، (خەمضیـوە) ی نوسیوە ، وەك لە گەلێ جێگەدا ، پاش ڕاستکردنەوەی ڕێنوسەکە ، ئیشارەم بۆ ئەم مەبەستە کردوە •

٢ـ لە شێوەی گفتوگۆی موکریدا چەند زاراوەی تایبەتیێ هەیە ؛ وەك (هەندێکی) لە جێگای (هەندێك) ، (جارێکی) لە بری (جارێك) ••• تـاد نوسەر بە روونی هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم مەبەستەیشی داوە و بـیری لێ کردەوەتەوە ، بەڵام ، وەك هەمو هەوڵێکی سەرەتایی ، چارەسەری تـەواوی نەدۆزیوەتەوە و بە گوێرەی بۆچونی خۆی هـێی خۆی ، کە لە ڕێنوسـی ئێستای کوردیدا لە جێی سەر (فەتحە) دائەنرێ ، بۆ ئەم مەبەستە داناوە و ، مەگەر لە بیری چوبێ ئەگینا لە سەرلەبەری دیوانەکەدا پەیرەوی ئەم نیشانەی کردوە، بەڵام لە لایەکی ترەوە ئەم هەوڵە بەهۆی سەرلێتێکدان تەواو ئەبێ و، خوێنەر ، ئەگەر باش شێوەی موکریێ ئەزانێ و زۆریش ورد نەبێ بە هەڵەدا ئەچێ ؛ چونکە نوسەری دەسخەتەکە ئەم نیشانەی لە جێگەی خۆیدا لە بری سەر (فەتحە)یش بەکار هێناوە و تەنها ڕێگەیەك بۆ دۆزینـەوەی مەبەسـت وریایی خوێنەر و شارەزایی شێوەی موکرییە • (٨)

---

(٨) وابزانم ئەم بۆچونەی ئێرەی لەسەر بنج و بنەوانی ڕێنوس و فۆنەتیکی زمانی فارسییە ؛ چونکە ( کە ) لە فارسیدا ، بە لکاویێ و بە جیاوازیێ ، =

٣ــ زۆر جار (ه)هێی لە باتی سەر (فەتحە) بەکار هێناوە وەك ( داوە ) یان ( دیوانە ) یان ( بستە ) ، بەلاّم وەنەبێ ئەمە لە هەمو جێگایەکدا کرابێ ، زیاد لەوەیش ئەبینین لە یەك وشەدا لە نیوەیدا پەیڕەوی ئەکاو لە نیوەی تریدا نایکات ؛ وەك (ورە) = (وەرە) و گەلێ جێگەی وەها .

لە کاتی بەراوردا (خ)م بۆ ئەم دەسخەتە کردوە بە نیشانە .

**وەصفێکی دەسخەتەکانی تر :**

زیاد لەم دەسخەتەی کە بە ئەصڵ دامنا ، کەڵکم لە چەند کەشکۆڵ وەرگرتوە و وەك سەرچاوە پشتم پێبەستون و شیعرم لێ وەرگرتون و جیاوازییانم لە پەراوێزدا دەس نیشان کردوە .

١ــ کەشکۆڵی **( مەلا رەسوڵی توربەیێ )**

ئەم کەشکۆڵە لەسەر شێوەی (بیاض) نوسراوەتەوە و ، (٢١٧) لاپەڕەیە و شیعری کۆمەڵێك لە شاعیرانی کوردی ؛ وەك : نالی و کوردی و ، وەفایی و ، فیکری و ، حاجی قادر و ، ئەختەر و ، مەولانا خالید و ... چەندین شاعیری تری تێدایە . بە خەتێکی فارسی شکستە نوسراوەتەوە ، نوسەرەکەی زۆر خوێندەوار نەبوە و هەڵەی ئاشکرای لە نوسینەوەکەیدا کردوە .

درێژی لاپەڕەکانی (١٧) سانتیمەتر و پانیشی (١١) سانتیمەترە . لە ساڵی ١٣١٠ ی کۆچیدا لە مزگەوتی مەلا جامی (کە لە کۆیەیە . م. ع. ق) لە خزمەت (مەلا ئەحمەدی ورمێیی)دا بە دەستی ( مەلا رەسوڵی توربەیێ ) نوسراوەتەوە .

بە گوێرەی یەك دو پارچەی دوایی دیارە کە نوسەر سەفەرێکی

---

=

بە (کی) ئەخوێنرێتەوە . ئەم نیشانەی لای نوسەرەکەیش دەقی ئەوەی فارسییە .

کەرکوکیشی کردوە و لەوێ ، لە کاتی سەفەرەکەیدا ، پارچەیەك شیعری خاقانی نوسیوەتەوە •

لە کاتی بەراوردا پیتی (ر) م بۆ ئەم کەشکۆڵە دانا • ئەم کەشکۆڵە تەنها پارچەی «هێند نەخۆشی دەردی دوریم وەختە گیان و دڵ دەرێ » ی تێدایە •

**٢ـ میناى شکستە :**

بە (ح) ئیشارە بۆ دەسنوسێك ئەکەم لە (م•هۆشەنگ) کاك (حەمە بۆر)م وەرگرت ، ئەم کەشکۆڵە ناوی ( **میناى شکستە** )یە و ، لە بنجدا ــ بە گوێرەی قسەی کاکە حەمە ــ سێ بەرگە ، بەرگی یەکەمی ، کە من دیومە ، ٤٤٠ لاپەڕەیە ، شیعری پتر لە ٦٥ شاعیری تێدایە • ئەم کەشکۆڵە کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ( **مامۆستا نجم‌الدین مەلا** )یە •

بە راستی مامۆستا نەجمەدین مەلا لە کۆکردنەوە و نوسینەوەی بەرهەمی شاعیرانی کورددا رەنجێکی فراوانی داوە و گەلێك دیوان و هۆنراوەی بە نرخی ئەو شاعیرانەی لە کەناری دەریای ونبون و لەناوچونەوە هێناوەتەوە بۆ جێگەی بێ ترس • بەڵام دیسان ئەوە جێگەی داخە کە پاش کۆچی دوایی ئەم مامۆستایە کتێبخانەکەیی و بەرهەمەکانی دەستی بەتەنگەوەهاتو نەپیاراستون و پرش و بڵاو بونەتەوە و رەنگە گەلێکیشیان لەناوچوبن •

مامۆستا نەجمەدین مەلا بە کۆکردنەوەی (میناى شکستە) کارێکی یەکجار دڵسۆزانەی بە ئەنجام گەیاندوە • بەڵام ئەگەر لە کارەکەیدا دو خاڵی رەچاو بکردایە سودی کارەکەی گەلێ گەورەتر ئەبو :

أ ــ کات و توانای خۆی بۆ نوسینی بەرهەمە چاپنەکراوەکان بەتایبەتی تەرخان بکردایە و کاتی لەگەڵ چاپکراوەکان بەسەر نەبردایە ؛

چونکه ئەبینین مامۆستا کاتێکی زۆری لە نوسینەوەی دیوانە چاپەکانی وەك : دیوانی مەولانا خالید و نالی و ... تاد بەسەر بردوە و لەبەر دیوانە چاپەکان رونوسی کردۆنەتەوە .

ب ــ لە کاتی نوسینەوەی مینای شکستە دا دیارە سامانێکی گەلێ گەورەی لەبەر دەستدا بوە ، بەلام ئەو کاری گوڵچنی لە ئەستۆی خۆی گرتوە و ، بە هۆی یەكباڵی و بێ یارمەتیدەرییەوە نەیتوانیوە خەرمانی هۆنەرانی کورد لە جێگەیەکی بەرز و راسایی و بەرشەماڵدا هەڵدا ، کە پاش پاككردن و کەو و بێژنگ خەرمانیان لێهەڵگیرایە ، زیاد لەوەش جار جار نەبێ دەس نیشانی ئەو سەرچاوانەی نەکردوە کە گوڵبژنی لێ کردۆن .

کارێکی تر کە زۆر جێگەی رێزە بۆ مامۆستا نەجمەدین مەلا لە مینای شکستەکەیدا ئەوەیە : بە گوێرەی دەرەتان و توانای خۆی هیچکام لەو شاعیرانەی لەبیر نەکردوە و دەربارەی ژیانی هەریەکە و شتێکی نوسیوە ، جاری وایش هەیە لە پەراوێزەوە لەو تەرجەمە کۆڵیوەتەوە و روی راستی ، بە گوێرەی بۆچونی خۆی ، دەرخستوە .

لەو سێ بەرگەی مینای شکستە بەرگی یەك و سێی لای مامۆستا هۆشەنگە . ئەم دو بەرگە (متفرقە) شیعری شاعیرانی کوردیان تیدایە .

بەرگی دوی مینای شکستە بریتییە لە دیوانی پیرەمێرد ، ئەم بەرگە لای ئەحەی چۆرە چێشتە ، کە خەڵکی سلێمانییە و ، ماوەی چەند ساڵێکە لە تاران دائەنیشێ .

مامۆستا هۆشەنگ دەفتەرێکی کەی مامۆستا نەجمەدین مەلای پیشاندام بە ناوی **( ئەوراقی پەریشان )** کە هەندێ شڕ و پەرپوت بو .

## ٣ـ ( سۆزی نیشتمان )

ئەم دەسخەتە بریتییە لە کەشکۆڵێکی گەورە کە (١٢٧٠) لاپـەڕەیە ، بێجگە لە پێڕست ، ناو و شیعر و بەسەرهاتی ١٨٠ شاعیری تێـدایە • ئـەم کەشکۆڵە لە ساڵی ١٩٤٢ زی ١٣٦١ی ك ی بە دەستی مامۆسـتا نەجمەدین مەلا لە سـلێمانێ نوسراوەتەوە •

ئەم کەشکۆڵە سەرچاوەی (مینای شکستە) و (ئەوراقی پەریشان ) ە ؛ چونکە ئەم لـەوان کۆنترە و لە کاتی بـەراوردی شـیعرەکانی وەفـاییدا جیاوازییەکی ئەوتۆم لە نێوان ئەم و (ح) دا نەدی • لە کاتی بەراوردا پیتـی (ن) م بۆ ئەم کەشکۆڵە دانا • ئەم کەشکۆڵە لای مامۆستا**صادق بەهائەدینە** ، زۆر سوپاسی ئەکەم کە ئەم کەشکۆڵەی پیشان‌دام ، بەڵام بە داخەوە ماوەی بینینەکەم تێر و تەسـەل نەبو •

## ٤ـ کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵێ :

ئەم کەشکۆڵە کەشکۆڵێکی گەورەی زۆر جوانە تێکڕا ــ جگە لـە چەند یادگارێك ــ بە قەڵەمی (مەلا فەتاحی کاگردەڵێ) [٩] نوسراوەتـەوە و

---

(٩) بۆ ژیانی مەلا فەتاح گەلێ پرسیارم کرد و گەڕام ، شـتێکی نوسراوم دەربارەی دەست نەکەوت . بە دەمێ لە مامۆسـتا مەلا عەبـدولکەریمی مودەڕیسم بیست کە: مەلا فەتاح خوێندەواریێ مەلایەتی هەبوە و مەلایەتی چەند دێی کردوە و بە نانی مەلایەتی ژیاوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی ئازا و چاونەترساو بوە و ، ڕۆحی عەشایەریێ تێدا بوە . لە دەور و بەری ١٣٤٠ی کدا کوژراوە ، شـێوەی کوشـتنەکەیشی ئەمەیـە : پێش ماوەیەك خزمێکی مەلا فەتاح ئەکوژرێ،بە ڕێکەوت مەلا فەتاح لە شاییەکدا قاتیلی خزمەکەی ئەبینێ ، مەلا فەتاح سوارچاك ئەبێ و چەکداریش ئەبێ هەر لەو شاییەدا هەڵئەکوتێتە سەر کابرای کە خزمـەکەی کوشـتوە و ئەیکوژێتەوە . پاش ماوەیەك کەس و کاری ئەم کوژراوە شەو لە جێگادا مەلا فەتاح ئەکوژنەوە . بەم شێوەیە ژیانی ئەم زانا ئەدەبپەروەرە کۆتایی پێ دێت و کەشکۆڵە ڕەنگینەکەی بە یادگارێـکی زینـدوێ لای ئـەدیب و ئەدەبدۆستانی کورد ئەمێنێتەوە .

شیعری کۆمەڵێکی زۆر لە شاعیرانی گەورەی کوردی تێدایە • ژمارەی لاپەڕەکانی لە (٧٠٠) زیاترە • بەشی هەرەزۆری شیعری کوردییە ، شیعری فارسیۆ و عەرەبیشی تێدایە •

نوسەرەکەی زۆر ئەدەبدۆست بوە و ، گەلێ بە تەنگ کارەکەیەوە هاتوە و کەشکۆڵەکەیشی بێ ئەندازە بەلاوە بە نرخ بوە و لە چەند لای کەشکۆڵەکەیدا ، بە نوسین ، سوێند ئەخوا تا خۆی زیندو بێ نایدا بەکەس و با کەس ، بە داواکردنی ، زێڕی خۆی لە سەنگ نەدات !

ئەم کەشکۆڵە لای نەوەی شێخ مارفی نەرگسەجاڕیۆ ماوەتەوە و ئەوەیش بە گوێرەی وەصیەتی مەلا فەتاح خۆی •

بۆ لێکۆڵینەوەی دیوانی وەفایی سودم لەم کەشکۆڵە وەرگرتوە و چەند پارچە شیعری وەفایی تێدا بو بەراوردم کردن ، زیاد لەوەش پارچەیەك شیعری تێدا بو کە لە هیچ لایەکی تردا نەبو • بۆ ئەم کەشکۆڵە ،لە کاتی بەراوردا ، نیشانەی (ف)م داناوە •

بەگوێرەی وێنەی لەبەر (میکرۆفیلم) هەڵگیراوەی کە لە لای منە درێژی هەر لاپەڕەیەکی (٢٥) سانتیمەتر و پانیشی (١٥) سانتیمەترە •

تێبینی : لەو جێگایانەدا کە بە ناچاریۆ گەڕاومەتەوە بۆ چاپەکانی پێشو بە (هـ) ئیشارەم بۆ چاپی هەولێر کردوە و مەبەستم دوا چاپە کە چاپی سێهەمی گیوە •

**وەفاییۆ و شیعری ئەویندارییۆ :**

لە سەرانسەری دیوانی وەفاییدا ــ بڵاوکراوە و بڵاونەکراوە ــ ، جگە لە چەند مەبەستێکی شیعرییۆ ، وەك : لاواندنەوە و وەصف و پیاهەڵدانی شێخان و داوای توتن و ••• تاد ئەوە ئاشکرایە کە شیعرەکانی (وەفاییۆ) رواڵەتێکی ئەویندارییۆ و ، باسی دڵداریۆ و ، ئاواتی بەیارگەیشتن و ،

دەربڕینی دەرد و ناسۆری دوری لە دولبەر و ••• یان پێوە رەنگ ئەداتەوە، بە جۆرێك کە ئەم مەبەستە بەشی هەرەزۆری دیوانی وەفایی گرتوەتەوە • لێرەدا ئەوەندە ئەڵێم : وەفایی بەم کارە مەیدانی فراوانی شیعری لە بەردەم هەست و بیری خۆیدا تەسك کردوەتەوە و خۆی دوچاری ئەو دو کەوانـەی ئەوینە کردوە ، کە ئەگەر وەفایی ئـەوینداریکی زۆر بە پـەرۆشیش بوبێ هێشتا هەر ئەوەندەی نەئەویست کە ئەو لە گەڵی ماندو بوە • لێرەدا وەنەبێ بمەوێ رەخنە لە وەفایی بگرم و نرخی دیوانەکەی کەم بکەمەوە ؛ بەڵکـو مەبەستم دیاری کردنی خاڵێکە کە بە پێویستی ئەزانم پەنجەی بۆ رابکێشم ، ئەوەیش دوپات بونەوەی یەك مانایە لە چەند جێگەی جیاجیادا • چـونکە وەفایی نزیکەی (١٠٠) پارچە شیعری ، هەر لەبەشی کوردیدا ، لە مەیدانی ئەویندا وتوە • ئەمە لە کاتێکدا نەیشی توانیوە مانای باس نەکراو و ، هەستی تازە و شێوەی تایبەتی بدا بە هەر پارچەیەك لە شـیعرەکانی • خـۆ ئەگەر وەفایی بەم شێوە مەیدانی شیعری لە بەردەمی خۆیدا تەسك نەکردایەتـەوە. دیوانەکەی زۆر بە نرختر ئەبو • کە ئەمە ئەڵێم وەنەبێ مەبەسـتەم ئەوەبێ داوای شتێك لە وەفایی بکەم لە بارەیدا نەبوبێ وەك بڵێـم : با شـیعری نیشتمانی بوتایە ، یان باسی جۆرە شتێکی بکردایە ، کە لە سەردەمی ئـەودا نەبیستراوە و باوی نەبوە •

زیاد لە دەست نیشان کردنی ئەم خاڵە لەم باسـەدا ، وەك هیوایـەکی نەهاتوەدی و ، کارێکی لەکارترازاو ، ئەوەندە ئەڵێم : کە ئەگەر وەفایی لـە مەبەستەکانی تری شیعریدا ئەسپی بیری خۆی تاو بدایە زۆر پێشـکەوتوتر ئەبو ، وەك ئەبینین لە چەند پارچە شیعرێکدا لە ئەوینداری دورکەوتوەتەوە زۆر هەستی ناسك و ، وشەی رەنگین و ، مانای خۆش و بە تامی هێناوەتـە کایەوە کە لە ئەوینداریدا دەست ناکەون • وەك لـە پارچـەی : « ئـەی رەفیقان وەرنە یاریم •••»دا ئاشکرایە • ئەوەیشی وەك دیاردەیەکی تـری

سەرنجڕاکێش ناتوانم باسی نەکەم ئــەوەیە وەفایی بــە جۆرێك لــەگەڵ ئەویندارێ ــ یان شیعری (۱۰) ئەویندارێ ــ دا شێلراوە ناتوانێ لە باسەکانی تریشدا لێی جیابێتەوە ؛ وەك ئەبینین لە شــیعرەکانی ســواڵ و داواکردنی تۆتنیشدا ئەو مەبەستە ئاوقای شیعرەکانی ئەبێتەوە :

**« ئــەو تۆتنە کە مــەیلی وەکو ( دڵ ) بــە ســۆتنە »**

**« ئەو تۆتنە کە (ڕەنگی) وەکو (عاشق) ئەصفەرە »(۱۱)**

وەکو وتم ، ئەم باسە هیچ لە نرخی دیوانی وەفــایێ کەم نــاکاتەوە و ئەوەندە بۆ وەفایێ بەسە کە ئەو هەمۆ وشە جوانانەی کوردێ بەو ئــاوازە خۆشانە بۆ تۆمارکردۆین و ، کە گوێ لە دەنگی گۆرانی بێژان ئەگرین کەم وا ئەبێ شیعرەکانی وەفاییمان بە بەستە و مەقــامی دەنگخۆشــانی وەك

---

(۱۰) کە ئەڵێم : ــ یان شیعری ئەویندارێ ــ مەبەستم پارێزە لە باسێك کە لە مامۆستا مەلا عەلی سنجەریم بیستوە و ئەوا لە خــوارەوە دەقــەکەی ئەنۆسم : **: مامۆستای سنجەرێ بۆی گێڕامەوە کە لە خوالیخۆش بــۆ پیرەمێردی بیستوە کە کاتێ چوە بۆ حەج لە نێوان مەکە و مەدینەدا لــە گەڵ وەفایێ بە یەك گەیشتۆن و ماوەیەکیان وتو وێژی ئەدیبانە بە یەکەوە کردوە ، لە پاشان وەفایێ بە پیرەمێردی وتوە : من خەڵکی سابلاخ پێم ئەڵێن : هەمۆ هۆنراوەکانت هەر باسی خەت و خاڵی کیژانە ، منیــش ئەمەم پێ ناخۆشە، چونکە هەمۆ شیعرەکانم هەر لە ستایشی پێغەمبەردان. دوایی بە پیرەمێرد ئەڵێ : من ئەمە جاری سێهەمە دێم بۆ حەج ، ئــەم جارە دواییە وەصیەتم بۆ خەڵك کردوە و پێم وتۆن : ئەگەر من شیعرەکانم بۆ کیژان وتبێ ئەوا ئەمجارەیش دێمەوە ، وە ئەگەر لە ستایشدا بێ ئەوا لای پێغەمبەر ئەمێنمەوە و لەوێ ئەمرم . پیرەمێرد وتی : دوای زیارەتی مەدینە چۆین بۆ زیارەتی ( اُحُد ) ، وەفایێ لــەوێ تۆشی نەخۆشــێ سك‌چۆن بۆ و لەوێ کۆچی دوایی کرد و بە خاك سپێررا .**

من لێرەدا ئەم باسە تەنها وەکو ئەمانەتێك ئەنۆســم و وا ئەزانم بێ لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ئەم باسە ناسەلمێنرێ ؛ چونکە شیعرەکانی وەفایێ ئەمەندە زۆرن و ئەمەندەیش بە زەقی لە ئەوین ئەدوێن گومان لەم بــاسە پەیــدا ئــەکەن .

(۱۱) بڕوانە دیوانی وەفایێ (دەسخەت) ل : ٦٨ .

**مەظهەری خالیقی** و **حەسەن زیرەك** و چەندین گورانی بێژی تر لە گوێدا ئەزرنگێنەوە[12] •

زیاد لەمانەیش دیوانی وەفایی بە سەرچاوەیەکی کوردی دائەنرێ بـۆ کاری فەرهەنگ‌نوسی و وەرگرتنی وشەی کوردی ڕەسەن لە شیعرەکانیەوە•

ئەمە لە کاتێکدا کە هیوای ئەوەیشم لە دڵ نەبڕیوە ــ وەك پێشتریش باسم کرد ــ کە ڕۆژانی داهاتو گەلێ شیعری جوان و هەستی نەبیستراو و باسی نەزانراوی ئەم شاعیرە بەرزەمان بۆ دەربخەن •

**وەفایی و تەئەثور بـە شاعیرانی کورد :**

ئەوە ڕونە کە وەفایی یەکەم شاعیری کورد نییە شیعری کوردی وتبێت، بەڵکو لە پێش ئەودا دەیان شـاعیر بەم زمـانە شـیرینە شیعریـان وتوە • وەفاییش یەکێکە لەو شاعیرانە و لە سەر ڕێبازی ئەوان شـیعری وتـوە ، بەڵام ئەوەندە ئەپرسین : ئایا وەفایی سودی لە هەست و بیری شاعیرانی پێش خۆی وەرگرتوە یان نا ؟ ئەگەر وایە ، بە کام لەو شـاعیرانە هۆگر بوە و ،

---

(١٢) زۆر لە شیعرەکانی وەفایی بە دەنگی دەنگ‌خۆشان تۆمار کراون و لـە ئێزگە کوردییەکاندا بڵاو ئەکرێنەوە ، گەلێکم بیر لەوە کردەوە لیستەیەك بەو پارچە شیعرانە و ئەو گۆرانی وێژانەی وتوانیان بگرم ، بەڵام نەزانینی ناوی زوربەی گۆرانی‌بێژەکان و دەسـت‌نەکەوتنی هـەمو ئەو پارچـە شیعرانە لەم باسەیان سارد کردمەوە ، لە گەڵ ئەوەشدا بۆ نمونە نـاوی چەند پارچە لەو شیعرانە ئەنوسم .

١ــ «ئەی دڵ وەرە هۆشیار ببە (هذا طریق العاشقین) » . بەڵام ئـەم (هذا طریق العاشقین )ە بوە بە : (ئاوایە ڕێگەی عاشقان) .

٢ــ « شیرین تەشی دەڕێسێ » بە دەنگی مەظهەری خالیقی .

٣ــ «هێند نەخۆشی دەردی دوریم وەختە گیان و دڵ دەرێ » دوبارە بـە دەنگی مەظهەری خالیقی .

٤ــ «لە بەر نازی چاو بازان . . .»

٥ــ «دەمێك ساقی دەمت بێنە . . . »

٦ــ «گوڵێکم بو لە دونیادا شکوفەی باغی ڕەعنایی »

لاسایی کێی کردوەتەوە ؟ ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە وەفایی بە شیعرەکانی مامۆستای شاعیرانی کورد ( نالی ) هۆگر بوە و گەلێ جار ماناکانی ئەوی هێناوە و خۆی بەرگێکی تازەی لەبەرکردوون ◦ وا لێرەدا ئەوەندەی ئەم جێگە ماوە بدات ، بە پێی بۆچوونی خۆم ، نموونە ئەهێنمەوە :

١ـ نالی ئەڵێ :

**« حەنایی کردوە پەنجەی بە خوێناوی دڵی زارم »**
**« ئەمە رەنگە شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دڵدارم »(١٣)**

وەفاییش ئەڵێ :

**« پەنجەی لە حەنا بەستوە ـ ئایا ـ گوڵم ئەمڕۆ ؟ »**
**« دەستی لە دڵی کوشتەیی خۆی خستوە ئاخۆ(١٤) ؟ »**

٢ـ نالی ئەڵێ :

**« دڵ موشەببەك بوو لەبەر ئێشانی نیشانی موژەت**
**حەیفە قوربان ! ئاخر ئەم نیشانەیی شانی هەیە »(١٥)**

وەفایی ئەڵێ :

**« دڵی پڕ ئێشی من بۆیە وەها خوونابی گریانە**
**هەموو سینەم وەکوو نیشانە جێگا نێشی موژگانە »(١٦)**

٣ـ کە هەندێك سەرنجی پارچەی «ئەی ساکینی ریاضی مەدینەی مونەووەرە» ل : ٤١٥ ی دیوانی نالی ئەدەین و ئەگەڕێینەوە بۆ لای پارچەی: « ئەی خۆش خەبەر نەسیمی سەحەر پەیکی عاشقان» ی ل : ٦٨ی دەسخەتەکەی وەفایی ـ لە گەڵ جیاوازی مەبەست لە نێوانیاندا : کە نالی بۆ پێغەمبەر ـ د ـ ی وتوە و ، باسی مەدینەی کردوە و ، وەفایی بۆ شێخی

---

(١٣) بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی نالی ، ل : ٢٧١ .
(١٤) بڕوانە : دیوانی وەفایی (دەسخەت) ، ل : ٩٣ .
(١٥) بڕوانە : مەلاعبدالکریمی مدرس ، دیوانی نالی ، ل : ٥٧٦ .

نەهرێی وتوه و باسی نەهرێی کردوه و ، دواییش داوای تۆتنی کردوه ــ لــە هەندێ جێگەدا ــ جگە لە کێش و قافیەیش ــ زۆر لە یەك ئەچن و وەفایێ لاسایی نالێ کردوەتەوە .. ئەوا چەند شیعرێك لە هەردو پارچەکە پێش چاو ئەخەین ؛ نالێ ئەڵێ :

**« طەیبــە کە یەعنی عەکســی بەقیعی هەمو عەبیر**
**طەیبــە کە یەعنی مایەیی ئــەو میشــکی ئەذفەرە**

**طەیبــە کــە یەعنی رۆژ و شــەوی طیبی عالــەمە**
**رۆژی کە وشکە ، شــەو تەڕە ، کافوور و عەنبەرە**

**لێوم لــە رۆژی رۆشنی کافوری وشکی ، وشــك**
**چاوم ، لە شەبنمی شــەوی وەك عەنبەری تــەڕە**

**طەیبە کە یــەعنی طەییب و طاهیر بە رەوحی رۆح**
**فەرقی ئەڵێن : گڵی لە گوڵ، ئاوی لە کەوثەرە»(١٧)**

. . . . . .

وەفــایێ ئەڵێ :

**« نــەهرێ کە جێگەیێکە هــەمو خاکی ســورمەیە**
**نەهرێ کە جەننەتی گوڵ و ، گوڵئاوی کەوثــەرە**

**نەهرێ غوبــاری عەطرە ، بوخاری بوخوری رۆت**
**خاکی تەڕی کە وشــکە هەمو میشــکی ئــەذفەرە**

**نــەهرێ وەهایــە بــا لــە گوڵاو و گوڵ ئاتەشــی**
**عەنبەر فرۆشــە ، خاکی لــە کەوثەر موخەممەرە**

**نــەهرێ کە خولدە نــەهری رەوان ســەلسەبیلییە**
**نــەهرێ کە پــاکی دار و دەوەن پــاکی عەنبــەرە**

**نــەهرێ کە خــاکی قیبلەمــە گولزاری گوڵبــەرە**
**نەهرێ کە شاری دیدەمە جێ راوی دولبەرە »(١٨)**

---

(١٦) بڕوانە : دیوانی وەفایێ چاپی هەولێر و مەهاباد (خوێناوی ،.... وەکو شانە کە جێگا نێشی ...) ل : ٨٧ و ١٢٠ ، وە دەسخەتەکە ل : ١١٧ .

(١٧) بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی نالێ ، ل : ٤١٥ .

(١٨) بڕوانە : دیوانی وەفایێ (دەسخەت) ، ل : ٦٨ .

لەم بارەیەوە گەلێ نموونەی تر هەیە ، بەڵام ئێمە بەم ئەندازە کۆتایی بەم باسە ئەهێنین و وێنەکانی تر ئەهێڵینەوە بۆ بیر و بلیمەتیی خوێنەری بەڕێز ، سەرنجڕاکێشان بۆ مەبەستەکە بەسە •

لێرەدا نابێ ئەوە پشت گوێ بخەین کە وەفایی تەنها بە لاسایی کردنەوەوە خەریك نەبوە بەڵکو گەلێ شاکاری جوانی هەیە و ،زۆر مانای ناسکی جوانی لە قاڵبی پڕجیناس و وردەکاریی بەدیعدا بۆ هۆندۆینەتەوە •

زیاد لەمەیش دیاردەیەك لە دیوانی شاعیرانی تردا هەیە لای وەفایی نابینرێ ، ئەو دیاردەیش ئەوەیە کە زۆر لە شاعیران هاتوون بۆ هەموو ، یان بەشی زۆری ، پیتەکانی هیجا قافیەیان دروست کردوە ، تەنانەت بۆ ئەو پیتانەیش کە لە کوردیدا یان هەر نین یان زۆر کەمن ، وەك ئەبینین نالی هاتوە بۆ پیتی (ث) و (ط)یش قافیەی دروست کردوە کە ئەم دوو پیتە لە کوردیدا نین ، کەچی وەفایی خۆی لەم گێژاوە رزگار کردوە و لە هەموو پیتەکاندا تەنها بۆ (١٦) پیت قافیەی داناوە •

**پارچەی شیرین تەشی دەڕێسێ :**

ئەم پارچە شیعرە ئەگەر بچێتە سەر [١٩] کە شیعری وەفاییە رۆیەك و مەبەستێکی تر بە شیعری وەفایی ئەدا کە ــ من بزانم ــ تا ئێستا باسی لێ

---

(١٩) کە ئەڵێم : ئەگەر بچێتە سەر . . . مەبەستم ئەوەیە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشم کە گومان لەم پارچە شیعرە ئەکرێ کە شیعری وەفایی بێ ، گومانەکەش لەوەوە دێ کە کاك هۆشەنگ حەمە بۆر لە پەراوێزی لاپەڕە ٢٩٣ ی (مینای شکستە) دا ئەڵێ : «بەوەدا کە ئەم تەصحیحاتەم لە بەر بەیاضی دەسخەتی مەلا عەبدوللای گەلاڵەکردووە (وا) دەرئەکەوێ کە هی وەفایی نەبێ بەڵکو هی شوعاعی بێ . » مەبەستی ئەوەیە تەصحیحاتی پارچەی شیرین تەشی دەڕێسێی کردوە . هەروەها ئەم پارچە لە دەسخەتەکەی لای منــدا نیە .

نەکراوە • ناشزانم ئەو باس نەکردنە هۆی بۆ نەچوون یان گوێ پێ نەدانە ؟

ئەو مەبەستە وەك من بۆی چووم و روونی ئەکەمەوە شێوەیەکی ئەدەبی روهەڵماڵراو و بێپەردەیە و ، وەفاییش ئـەیەوێ لەگەڵ شـیریندا ـ تا ئەندازەیەك ـ وەکو نالی لەگەڵ ( مەستوورە )دا لاسایی نالی بکاتەوە و بـە رێگەی ئەودا بڕوات • وەرە با بە یەکەوە ئـەم پێنج خشتەکییانە بەرو دوا بخوێنینەوە :

**« شەوێ لـە بیرەخەودا جەمالی ویم بـە دڵ دی**
**دو چاوی مەسـت و کاڵم وەکو غەزالی سڵ دی »**

ئەمە لێرەدا بە روونی لە خەوبینین ئەدوێ • وەك ( نالی ) مەستوورە لە خەودا دەبینێ •

« قوطوی لوئالییانە لە زیوی داڕژاوە
لەبالەبە لـە حیکمەت لە شەهدی هەڵکراوە
لە بەر نەزاکەتی رۆژ رواقی دادڕاوە
بە طەرزی درزی دەرزێ لە خۆوە درزی داوە »

یـان ئـەڵێ :

**« شکۆفە وا هەڵسـتێ لـە زێڕ و زیو ( حوبابێ)**
**لـە کەوثـەری بەهەشـتێ دەروونـی پڕ کرابـێ**
**خـڕ و لـەطیف و نـازك بلـوری خودنـومابێ**
**بـە جورمی نوکی دەرزێ لـە نیوی درزی دابێ »**

یان لـەمانە روونتر ئـەڵێ :

**«شیفای جەراحەتی دڵ تەشی نەبو، کەی رستی ؟!**
**شەشپەڕەکەی کاکی خۆی پڕ ئاو و پڕ بە مسـتی**
**هەتیوی کەللەشـەق بو بـە داوی حیلە بەسـتی**
**لـە تاوی هاتوچۆدا بـە لێوی خونچە گەستی »**

ئەوەی من بۆی چوبم مەبەست لە( **شەشپەڕ** ) ی (پڕئاو و پڕ لە مست)

( هینه‌که‌ی ) شاعیره و جارێکی تریش ئه‌یکات به ( هه‌تیوی **که‌لله شه‌ق !** ) و مه‌به‌ست له **( خونچه گوڵ )** (شته‌که‌ی) شیرینه و (به‌ستن) و (گه‌ستن) و (هاتوچۆ)یش ئاشکران •

وه نزیك له‌م پڕ له مستـــه ئه‌ڵێ : « سه‌مـــای به ذو ذه‌نه‌ب دا ( کف الخضیب)ی شیرین » له نوسخه‌ی (ن)دا ئه‌ڵێ : (کف القضیـــب) ئه‌مـــه‌ش له‌گه‌ڵ ( پڕ له مست )دا پڕ به پێسته • له جێگه‌یه‌کی تردا ده‌ڵێ :

« به دڵ به دیده سۆسه‌ن به خونچه‌گوڵ یه‌ره‌ق بۆ
شه‌شپه‌ڕه‌که‌ی وه‌فایی کولوفت و تیژ و ره‌ق بۆ »

به گوێره‌ی نوسخه‌ی مه‌لا عه‌بدوڵلای گه‌لاڵه‌ش که له په‌راوێزی (ح)دا کاك هۆشه‌نگ نوســـیویه ده‌ڵێ :

**« شـــه‌قایقێکی شـــه‌ق بو له هاتوچۆدا له‌ق بـــۆ »**
**« به عاره‌قی عوروقی که سه‌رخۆشی عه‌ره‌ق بۆ »**

جارێکی تر له‌م شیعرانه‌دا له وشه‌کانی (یه‌ره‌ق) و (هاتوچۆ) و (کولوفت) و ( تیژ ) و (ره‌ق) و (شه‌ق) و (له‌ق) و (عاره‌ق) و (عوروق) ورد به‌ره‌وه که تێکڕا زۆر به زه‌قی مه‌به‌سته‌که به ده‌سته‌وه ئه‌ده‌ن .

که له خوێندنه‌وه‌ی ئه‌م چه‌ند پێنجخشته‌کییه هه‌ڵبژارده‌یه ئه‌بینه‌وه و تۆزێك له گه‌ڵ به‌راورد له گه‌ڵ ( مه‌ستوره )ی ( نالی )دا سه‌رنجی ماناکانیان ئه‌ده‌ین ئه‌وه‌مان لێ رۆن ئه‌بێته‌وه که وه‌فایی شوێن نالی که‌وتوه و لاسایی پارچه‌ی ( مه‌ستوره )ی نالی کردوه‌ته‌وه ، زیاد له‌مه ئـــه‌وه‌ش رۆنه که نالی رچه‌ی ئه‌م رێگه‌ی شـــکاندوه و وه‌فایی شـــوێنی که‌وتوه ــ وه‌فایی له نالی سه‌رکه‌وتوتر نییه له باســـه‌که‌دا و ، پارچه‌که‌ی نالی هه‌ر به شـــاکاری ئه‌م مه‌به‌سته ئه‌مێنێته‌وه ، وه جگه له لاسایی‌کردنه‌وه جیاوازییه‌ك له نێوان ئه‌م دۆ پارچه‌دا هه‌یه ئه‌وه‌یه : وه‌فایی له هه‌ر جێگه‌یه‌کدا له‌و مه‌به‌سته دواوه زۆر به زه‌قی و بێ‌په‌رده ده‌ستی بۆ بردوه و ته‌قه‌ی له بنی کۆله‌که هه‌ڵساندوه و

هیچی تێدا نەهێشتوە • ئەمەش هۆی ئەوەیە وەفایی نەیتوانیوە وەکو نالی یاری بە وشە بکات و لە توێی وشەکاندا داوی دوو سێ تا بنێتەوە •

**مەبەستەکانی شیعر لە لای وەفایی :**

وەکو روونە دوو سێ مەبەستی سەرەکی بەشی هەرەزۆری شیعرەکانی وەفایی ئەگرنەوە و ، ئەگەر چەند مەبەستێکی تر بێتە گۆڕەوە ، بە یەك پارچە شیعر ، یان بە چەند شیعرێك لە پارچەیەك مەبەستەکە ئەبڕێتەوە ، ئەوا لێرەدا تێکڕای مەبەستەکان لای وەفایی باس ئەکەین :

١ــ شیعری دڵداری ، ئەم مەبەستە لایەکی زۆری شیعرەکانی ئەگرێتەوە •

٢ــ شین و لاواندنەوە ، لەم مەبەستەدا درێژترین پارچە شیعری بە کوردی لە لاواندنەوەی شێخ عوبەیدیللای نەهرێدا وتوە • ئەم پارچە (٦١) شیعرە و گەلێ هەستی جوان و سۆزی بە کوڵی تێدایە • هەر وەها لەم مەبەستەدا هەر بۆ شێخی ناوبراو پارچەیەکی فارسیشی نوسیوە زۆر لە شێوە و شێواز و مەعنادا لەم پارچە ئەچێ ؛ وەك یەکێکیان لەوی تر وەرگیرابێ وایە •

٣ــ وەصفی گوڵ و گوڵزار و باسی بەهار و دیمەنی جوان و گوڵبازی • لەم مەیدانەدا گەلێ مانای ناسکی هۆندۆتەوە و هەستی جوانی تۆمار کردوە •

٤ــ هەندێك دیمەنی قۆشمەبازی و گاڵتە ؛ وەك پارچەی :

**« ئەی رەفیقان وەرنە یاریم زۆر زەلیلم دڵ شکاو »**

پارچەی (١)ی (واو) •

٥ــ مەتەڵ ؛ وەك پارچەی (١)ی پیتی (میم)ی بەشی فارسی •

٦ــ پیاهەڵدان ، وەك پیاهەڵدانی شــێخی نەهریّ و باســی تەکیە و خانەقایان و کەرامەتیان و پیاهەڵدانی غەوثی ثانی[٢٠] •

٧ــ داواکردنی شت ، وەك داواکردنی تۆتن لە شێخی نەهریّ •

**بەشکردنی شیعرەکانی دیوانی وەفایی :**

ئــەگەر بمانەویّ هەندێك خوێنەر لە هەوڵ و کۆشــشمان دەربارەی کۆکردنەوەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە ئاگادار بکەین و جیاوازییەکی نەختێك ورد بخەینە نێوان شــیعرەکانەوە و رێنومایی خوێنەر بکەین بــۆ لای ئەو هەوڵانەی لەمەوپێش لە گەڵ ئەم دیوانەدا دراون و خوێنەر بێ سەرئێشە سەرژمێرێکی ئەو پارچانە بزانێ کە تا ئێستا چاپ نەکراون ئەبێ شیعرەکان بەم شێوەی خوارەوە بەش بکەین :

١ــ بەشی فارسیّ کە (٩٢) پارچە شیعرە و تائێستە چاپ نەکراوە •

٢ــ بەشی کوردیّ ، ئەم بەشە ئەبی بەم جۆرە جیا بکرێتەوە :

أ ــ بەشی بڵاونەکراوە کە لە دەسخەتەکەی مندا هەیە و لە هیچ جێگەیەکی تر دەستم نەکەوتوە • ئەم بەشە (٣٨) پارچەیە •

بــ بەشی بڵاونەکراوە کە لە دەسخەتەکەی لای مندا نیە ، ئەم بەشە یەك پارچە شیعرە لە کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵیّ وەرگیراوە •

جــ بەشی بڵاوکراوە کە لە چاپەکان و دەسخەتەکەی لای مندا

---

(٢٠) ( غەوثی ثانی ) سەیید طاهای باوکی شێخ عوبەیدیللایە . وەفاییّ زۆری خۆشویستوە و شیعری بۆ وتوە و پارچەیەکی تایبەتی لە بەشی کوردیّ بڵاونەکراوەدا بۆ وتوە و سەروای پارچەکە تا دوایی بەم شێوەیە : « یــا غەوثی ثانی هیممەتیّ » هەروەها (غەریقیّ) لە شیعرەکانیدا کە بۆ وەفاییّ نوسیوە باسی (غەوثی ثانی) ئەکات .

هەیە • ئەم بەشە تێکڕای دیوانــە چاپەکانە • جگە لە (٨) پارچە •

د ــ بەشی بڵاوکراوە کە لە چاپەکاندا هەیە و لە دەسخەتەکەدا نیە • ئەم بەشە (٨) پارچەیە پارچەیەکیان « چێشــتم ••• نەهات» شــیعری (کوردیؔ)یە بواردمان • «سەرابســتان ــ ئەمڕۆ » گومانم لــەم پارچە هەیە و باسم لێ کردوە • پارچەی « چەمەن یەکبارە خامۆشە ••• »م بوارد ، چونکە لای گیو تەواو نەکراوە و نازناوی شاعیری تێدانیە ، دوایی سەیدیان تەواوی کردوە ، هەروەها پارچەی : « ئەی گەلی خزم و برا» کە سەیدیان زیادی کردوە و ، « سەروی ناز و نازەنینان » کە لە چاپی (٢)ی (هـ)دا هەیە و لە (٣)دا نیــە چونکە بە شیعری وەفاییم نەزانین ، و (٤) پارچەی تر کە لە پەراوێزەوە دیاریم کردوٚن •

**ژیان و بەسەرهاتی وەفایی :**

لە کاتی لێکۆڵینەوەی دیوانی شاعیرانی شێوەی کلاسیکیماندا گەلێ قۆرت و کۆســپی گەورە ڕێگە بە توســەر ئــەگرن و تــەنگەنەفەس و هەناسەسواری ئەکەن و ماوەی ئەوەی نادەن بــە ڕێگای کارەکەیدا بڕۆا تا دەگاتە ئەنجــام •

ئەم کۆسپانەش کاتی وا هەیە هەر لە ناوی شاعیرەوە دەست پێ ئەکەن و بە زنجیرەی بنەماڵەی شاعیر و شوێن و نیشتمان و جێگا و کاتی لەدایکبوٚن و شێوەی ژیانی و خوێندنی و مامۆستاکانی و ••• تا ساڵی کۆچی دواییدا تێدەپەڕن • ئــەمە جگە لــە دەستگیرنەبوٚن و لەناوچوٚنی شیعرەکانی و نەزانینی مەبەست و کات و موناسەبەی وتنیان و چەندین مەبەستی تر •••

که ئەمانە چەند دەوری گرنگیان لە ڕۆنکردنەوەی ڕێـگای لێکۆڵینەوەدا هەیە و ، بە پێچەوانەشەوە نەزانینیان چەند ئەو ڕێگایە سـەخت و دژوار ئەکات و بڕیبەس لە خاوەن مەبەست ئەبڕێ و هەر لە سـەرەتاوە ماندۆی ئەکات و پەکی ئەخات •

وەفاییش یەکێکە لەو شاعیرانەی کە هەر لە هەوەڵ قۆناغەوە کۆسپی گەورە ڕێگەی نۆسەر لە عاستی لێکۆڵینەوەی شیعرەکانیدا ئەگرێ و ، وەکو باسیشمان کرد ، ئەو نۆسینانەی گیو و سەیدیان جێگەی بڕوا نین و پشتیان پێ نابەسـترێ • لێرەوە کۆسـپەکانی ڕێگەی منیـش ، کـە خەریـکی لێکۆڵینەوەی دیوانی وەفاییم ، دەست پێ ئەکەن •

تەنها ڕێگەیەك کە هەندێ تروسکەی ئەوەی لێوە بێت ڕۆشنایی بەم باسە بدات پرسیارکردنە لەوانەی بە هۆی هاوچەرخێ و نزیکی لە جێگا و شوێن و قوتابیانی وەفاییەوە هەندێك هەواڵیان لە ژیان و بەسەرهاتی بێ ئەمەش بە هۆی دۆرەدەستییەوە بۆ من نەکرا •

ئەوەی بۆم مایەوە وەك سەرچاوە شتێکی دەربارەی ژیانی لێ وەربگرم گۆڤـار و ڕۆژنامە و دەسخەتە کوردییەکان بۆن ، منیش ئەوەی دەستم پێی گەیشتبێ پشکنیومە و ، بە شوێن مەبەسـتدا گەڕاوم و پـاش هـەوڵ و تەقالایەکی زۆر هەندێ شتم بە دەست هێنا کە زۆر یەکیش ناکەون و ، لـە ئاڵۆزێ و جیاوازێ بەدەر نین و ، بە هەمۆیان ڕاستییەکی تەواو بە دەستەوە نادەن •

**نـاوی وەفـایێ :**

وەفایێ ناوی میرزا عەبدولڕەحیمی کوڕی مەلا غەفۆری کوڕی مەلا نەصروڵلایە •

## ساڵی لە دایکبونی :

بڕوا بەوە نــاکرێ بە ئاسانی و بێ سەرئێشـــە و ماندوبونێکی زۆر بتوانرێ مێژوی لەدایکبونی زانایەك یان پیاوێکی گەورە بدۆزرێتەوە و بێ سێودو دان بە ساڵی لەدایکبونیدا بنرێ • قسەم لەوە نیە ئەو کەسەی بۆ ساڵی لەدایکبونی ئەگەڕێین بەچکە مەلایەك بێت و ــ بگرە تۆبەرەیش بێت ــ کە هەر بە لەدایك بونی ، باوکی قەڵەمە قامیشەکەی هەڵگرتبێ و پەلاماری کتێبێکی دابێ و مێژوی ژیانی لە پاڵدا تۆمار کردبێ و دوای ئەو دەســت خوێندەواران کەوتبێ ؛ چونکە ئەو زانا کاتی لەدایکبونی منداڵێك بوە وەکو هەمو منداڵەکانی تری دێ و شارەکان و لەو کاتەدا کەس نەیزانیوە پاشە ڕۆژ ئەبێ بە زانایەکی گەورە و لە جیهاندا دەنگ ئەداتەوە و ڕو و باری ناوچەیەك یان وڵاتێك بە هۆی ئەوەوە ئەگۆڕێ ، بۆیە کاتی لەدایکبونی ئەو بایەخەی پێ نادرێ و هەر وەك هەر منداڵێکی کە لەو دەمەدا لەدایك ئەبێ باســی ئەویش ئــەکرێ (٢١) •

لێرەدا مەبەستمان ساڵی لەدایکبونی وەفاییە و ، ئەو سەرچاوانەی من خوێندومنەتەوە و کەڵکم لێ وەرگرتون ساڵی ١٨٤٤ ز ی ١٢٦٠ ك ی بــۆ ساڵی لەدایکبونی وەفایێ دائەنێن • جا ، وەك لەمەولا باسی ئەکەین ، ساڵی کۆچی دوایی وەفایێ ، لــەگەڵ ئەوەشــدا لە چەند ســەرچاوە و ڕوداو وەرگیراوە و ئەو ڕوداوانە ئاز و گوێز کراون و هەڵسەنگێنراون ، هێشتا بە شێوەیەکی ڕاست و بڕواپێکراو ساڵی کۆچی دوایی دیاری نەکراوە ، لــە گەڵ ئەوەشــدا کە وەفایێ ــ کاتی کۆچی دوایی ــ زانایەکی ناســراو و شاعیرێکی پایەبەرز بوە ••• جا ئەبێ چۆن یەکســەر دان بەوەدا بنرێ کە وەفایێ لە ساڵی ١٨٤٤ دا هاتوەتە جیهانەوە ؟!

---

(٢١) بڕوانە : محمد علی القرەداغی ، الشیخ عبدالله الخرپـانی من خــلال مخطوطات مکتبتە ، گوڤاری کۆڕی زانیاری کورد ٢/٢ .

## ژیانی وەفایی :

بە گوێرەی دەرەتانی خۆم و تا مەچەکیشم چەرخابێ ــ وەك باسمان کرد ــ لەم لاو لەو لاوە هەوڵم داوە و بە ناو گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکاندا گەڕاوم بۆ ئەوەی شتێکی راست و دروست لە سەر ژیان و بەسەرهاتی وەفایی بنوسم بەڵام جگە لە هەندێ نوسراوی پرژ و بڵاو کە لە کون و قوژبنی گۆڤار و رۆژنامەکاندا دۆزیومنەتەوە هیچی کەم دەست نەکەوتوە • وا لێرەدا دەقی ئەو نوسراوانە پێش‌چاوی خوێنەری بەڕێز ئەخەم :

لە ژمارە ( ١٣٠٣ )ی رۆژنامەی ( ژین ) دا لە ژێر ناونیشانی (شیعر و شاعیرەکانمان ــ وەفایی)دا ئەم وتارە بڵاوکراوەتەوە :

**« سەرداری شاعیران وە بولبولی خۆشخوانی باخچەی وڵاتی موکریان (وەفایی) ناوی حاجی میرزا عەبدولڕەحیم ، کوڕی مەلا غەفورە ، ١٨٤٤ م لە شاری سابلاخ ــ مەهاباد هاتوەتە دونیاوە ، وە هەر لەوێشدا خوێندنی بە پایان گەیاندوە • پیری نەهرێ ــ بەهەشتی شێخ عوبەیدیللا عاشق و شەیدای شیعرەکانی بوە • (وەفایی) بانگ‌کردوەتە لای خۆی ئەویش چوە لەوێ بوە بە هاوڕاز و نوسەری تایبەتی شێخ •**

**وەفایی دوو جاران دیدەنی ماڵی خوای کردوە ، جاری سێیەم هاتوەتە سولەیمانی لە تەك شێخ سەعیدی حەفید و سەید ئەحمەدی خانەقا و حاجی توفیق بەگ ــ پیرەمێردا ئەمجارەیش بۆ ماڵی خوا بەڕێ‌کەوتوە ، ساڵی ١٣٢٠ هـ ١٩٠٢ م لە چۆڵی شامدا کۆچی دوایی کردوە ، هاوڕێکانی لەو دەشتە دیمە ناشتویانە • شیعری وەفایی لە کێشدا هەر یەکەی ئاهەنگێکی تایبەتی هەیە • دیوانی شیعری ساڵی ١٩٥١ م لە لایەن (مامۆستا گیوی موکریانی)یەوە چاپ کراوە •**

**ئەمە نمونەیەکی شیعری وەفاییە :**

**« لەو رۆژەوە دوور بوەتەوە سایەت لە سەری من »**

بە بێ سەرچاوە دیاری کردن و ، باسی ناوی نوسەر •

★ ★ ★

ماموستا نەجمەددین مەلا لە لاپەڕە (٢٢٣)ی بەرگی یەکەمی (مینای شکستە)دا دەربارەی وەفایی نوسیویە :

**« وەفایی ناوی مەلا عەبدولڕەحیمە ، خەڵکی وڵاتی موکریانە ، لە شاری سابڵاخدا هاتوەتە دونیا ، تەحصیلی عیلمی لە شاری سابڵاغدا کردوە ، هەتا ئیجازەی عیلمی وەرگرتوە . لە ساڵانی ١٣١٨ ی هیجری هاتوەتە سلێمانی لە تەك خاوەندی رۆژنامەی (ژین) حاجی توفیق بەگ و ، شێخ مصطەفا کوڕی شێخ عەبدولصەمەدی قاضی و ، سەید ئەحمەدی خانەقادا چوە بۆ حەج ، پاش ئەوەی کە حەجیان کردوە لە گەڕانەوەدا لە رێگای عەرەبستان وەفایی ـ مەلا عەبدولڕەحیم عومری خوای کردوە . (حاجی توفیق بەگ) ئەفەرموێ : بە دەستی خۆم لە لمی چۆڵی عەرەبستاندا ناشتومە . وەفایی شیعرەکانی زۆر دڵگیر و بێ قۆرت و گرێیە . ئەم ئەشعارانەی کە لە ئائیدا نوسراوە لە بەر دەسنوسی موتەقاعید (محەممەد عەلی کوردی) وەرم گرتوە » (٢٢) .**



هەروەها ماموستا نەجمەددین مەلا لە لاپەڕە (١٣٢٠)ی (سۆزی نیشتمان)دا دەربارەی وەفایی نوسیویە :

**« ناوی مەلا عەبدولڕەحیمە و ، خەڵکی ساوجبلاق = سابلاخە ، یەکێکە لە عالمە گەورەکانی وڵاتی کوردستان ، لە پایەی شیعر و ئەدەبدا بێ هەمتا بوە . وەفایی ژیانی خۆی زۆرتر لە وڵاتی سلێمانیدا بەسەر بردوە و ، لە گەڵ عالمە گەورەکانی سلێمانی رای‌بواردوە . ساڵی ١٣٢٠ی هیجری چوە بۆ حیجاز بۆ ئەدای فەریضەی حەج لە رێگا وەفاتی کردوە . خاوەندی رۆژنامەی (ژین) شاعیری بە ناوبانگ حاجی توفیق بەگ ـ پیرەمێرد هاوڕێی بوە . پیرەمێرد ئەڵێ بە دەستی خۆم لە لمی عەرەبستاندا وەفاییم ناشتوە . شیعری وەفایی بێ قۆرت و گرێیە و شیرین و ئاوداره ، داخی گرانم دیوانی ئەشعاری چاپ نەکراوە . وا هەڵبژاردەی دیوانی وەفایی لێرەدا ئەنوسین تا خوێندەواران زەوقی لێ وەرگرن » .**



وە کاك محەمەد رەسوڵ هاوار لە (پیرەمێردی نەمر)دا دەڵێ :

---

(٢٢) زۆرم هەوڵ دا ئەم دەسخەتەی محەمەد عەلی کوردی دەست بخەم بەڵام ئەنجام بێ سەر و سۆراخ گەڕامەوە .

**« له سالّی ۱۸۹۸دا له گەلّ شێخ سەعیدی حەفیدا (باوکی شێخ مەحموودی قارەمان) چوە بۆ تورکیا ، بۆ سالّی دوایی شێخ سەعید و توفیق پێکەوە چوون بو مەککە بۆ حەج ، لە گەڕانەوەیا بۆ تورکیا سەید ئەحمەدی خانەقا و ، وەفایی شاعیریشیان لە گەلا ئەبێ ، وەفایی لە ڕێگا کۆچی دوایی کردوە ... » (۲۳) .**

★ ★ ★

بەلّێنم بە خوێنەری بەڕێز دا دەربارەی ژیانی وەفایی چیم لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا دەست کەوتبێ دەقەکەی پێش‌چاوی بخەم بۆیە ئەبێ باسێك لەو وتارە بکەم کە کاك یوسف ئەحمەد دەرگەلّەیی لە ژمارە (۱)ی گۆڤاری ( بەیان )دا[۲٤] دەربارەی وەفایی نوسیویە : بە داخەوە کاك یوسف خۆی بە وتارەکەیەوە ماندو نەکردوە و، بە شوێن شتی تازەدا نەگەڕاوە و، تەنانەت ئەو شتانەیش کە کۆن لە سەر وەفایی نوسراون ئەو باسی لێ نەکردون ؛ بۆیە ئەلّێین : وتارەکەی گواستنەوە و دوبارە کردنەوەی چەند دێڕێکە لەوەی مامۆستا گیو لە چاپەکانیدا دەربارەی وەفایی نوسیویە و ، شتێکی تیانیە سەرنج رابکێشێ و سودێك بە باسی ژیان و بەسەرهاتی وەفایی بگەیەنێ ، لە بەر ئەوە منیش — بێ پاش‌گەز بونەوە لە بڕیارەکەم — بە پێویستم نەزانی دەقی وتارەکەی بنوسمەوە .

مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە **( مێژوی ئەدەبی کوردی )** دا دەلّێ :
**« میرزا ڕەحیمی وەفایی ۱۸۳۸ — ۱۸۹۹ » .**

واتە : سالّی ۱۸۳۸ ی ز لە دایك بوە و ، سالّی ۱۸۹۹ ی ز لە جیهان دەرچوە[۲٥] .

زیاد لەم ئەندازە شتێکی ترم دەست‌نەکەوت شێوە و باری ژیان و

---

(۲۳) بڕوانە : محەمەد ڕەسوڵ هاوار ، پیرەمێردی نەمر . ل: ۱۳ .
(۲٤) بڕوانە : گۆڤاری بەیان ژمارە یەك ، تشرینی دوەم ، سالّی ۱۹٦۹ .
(۲٥) بڕوانە : عەلائەدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ، ۱۳۷۱ هـ — ۱۹٥۲ م ل : ٥٤۳ .

ئیش و کاری وەفاییم بۆ ڕوون بکاتەوە • وەکو سەرچاوەیەکی کە بە گوێرەی ئەوەی بۆ من ڕوون بوبێتەوە بە ناو دیوانەکەیدا گەڕاوم و ، هەرچی بۆنی ئەوەی لێ بێت ڕۆشنایی بە باری ژیانی بدات لێی وردبومەتەوە ، وا هەندێك لەو شیعرانە پێشچاوی خوێنەری بەڕێز ئەخەم ؛ لە هەندێ شیعردا ئەتوانین ئەوە ڕوون بکەینەوە کە وەفایی بە مەلایەتی ژیاوە و ژیانەکەشی ژیانێکی خۆش نەبوە و زۆریش پێی ڕازی نەبوە ، بەڵکو نارازێتی خۆی لە سەرفیترە و زەکات و نانی مەلایەتی دەربڕیوە و ، ئەو جۆرە ژیانەی بەلاوە پەسەند نەبوە ، لێرەدا ئەم شیعرانە بخوێنەرەوە تا ئەم مەبەستەت لێ ڕوون ببێتەوە :

**« هەزار صەوم و صەلات بێ ،**
**چاوت لە دوای زەکات بێ**
**خودات نیە ، حەیات بێ !**
**قەط وا نیە تۆبە کار**
**تف لە ڕەنگ و ڕەوانت ،**
**دەگەڵ فیعل و ژیانت ،**
**چی تێدا نیە دوکانت ،**
**چت بکڕێ خڕیدار » • • •**

یان بمانەوێ شێوەی نەدارایی و دەستکورتی وەفایی بزانین ئەم پارچە شیعرەی خوارەوە ــ هەرچەند ڕواڵەتی گاڵتە و قۆشمەبازییە ــ ئاوێنەیەکی ڕاستی باسەکەمانە و لە سەر زمانی وەفایی خۆی بۆمان دەر ئەخا : کە وەفایی زۆر نەدارا و بێ سامان و دەرامەت بوە و زۆریش فیکر و خەیاڵی لای پارە بوە و ، پارە بە میوانی نەبێ گیرفانی نەدیوە و ، ڕەنگە کێچ لە گیرفانیدا بۆ پوڵێك سەوزەڵێ و خانمی وتبێ ، ئەمەیش چەند شیعرێك لەو پارچەیە :

**« ئەی ڕەفیقان وەرنە یاریم ،**
**زۆر زەلیلم دڵ شکاو**
**جان و دڵ مەحرۆقی نارم ،**
**ئاخ لە بۆ تێرێك دراو !**
**ئاخ لە بۆ تێرێك دراوان !**
**نوری دڵ ، بینایی چاوان ،**

**مەرهەمـــی دڵکـــونکراوان ،**
**مۆمیـــای پشتـــی شـــکاو**
**زێـــڕ و زیـــو فیکر و خەیـاڵمە ،**
**دایـك و بـاب و مـام و خـاڵمە**
**دولبـەری صـەد مـاه و سـاڵمە ،**
**لازم و مـــەلزوم کـــراو**
**زێـــڕ و زیـو بــابی هەتیـــوان ،**
**غەوث و قـــوطبی هیـچ نەدیوان**
**ئــاخ کە لــە منیش بۆتە میوان ،**
**دیـن و دڵ بۆی دانـراو !)) ...**

مامۆستایان زەبیحیٖ و هێمن دەڵێن :

وەفایی لە سابلاغ قوتابخانەی هەبوە و دەرسی بە منداڵان وتوە و ، ئەمە یەکێك بوە لە رێـگای گوزەران و ژیـانی ، زەکات و سـەرفترەی وەرنەگرتوە و زۆر لە سواڵکردن بێزار بوە و خێزانیـشی ئەوەندە نەبوە موحتاج بێ . رەنگە ئەم شیعرەی لە هەجوی مەلا سواڵکەرەکاندا وتبێ .

**رۆیەکی تری ژیان و بەسەرهاتی وەفایی :**

موناسەبەی وتنی شیعر و کاتی و جێگای دەورێـکی بـاڵایان لـە رونکردنەوەی مەبەست لە شیعری شاعیردا هەیە و بە هۆیانەوە ئەتوانرێ لە رێبازی شاعیر لە شیعروتندا و خوٚ و رەوشـت و رەفتـاری لە گەڵ دەور و بەری خۆیدا و ، بیر و رای دەربارەی گەلێ شت و ، دامەزراویٖ لەسەر یەك رێباز ، یان ئاڵ و گۆڕ و جۆری ئەو ئاڵ و گۆڕانە لە ناو دێڕەکانی شیعری شاعیردا بە لێکۆڵینەوە بزانرێ ؛ نەزانینی موناسەبە و کات و شوێن رێگەی لێکۆڵینەوەی ئەو بارانە ئاڵۆز ئەکا . لە گەڵ ئەمانەشدا بە هـۆی چەنـد شیعرێکەوە ــ هەرچەند موناسەبەشیان نەزانین ــ پاش هەڵسەنـگاندن و ئەمبەرەوبەر ئەتوانم بڵێم : وەفایی گۆڕانا بـە سـەر رێبـاز و شـێوەی شیعریدا هاتوە و وەك زۆر گەنج لە سەرەتای ژیانیدا سەوداسەر و پەرێشانی

کۆڕی رابواردن بوە و ، ئاواتی بەیارگەیشتن کاتێکی زۆری لە ژیانی بردوە و ، بەشێکی فراوانی شیعرەکانی گرتوەتەوە و ، لەو پێناوەدا گەلێ شتی گەورە و قورسی بەلاوە ئاسان بوە و ، زۆر شتی بۆ بەولاوە ناوە • تا کاتێك ــ کە نازانم لە چ تەمەنێکدا و کەی بوە ــ بە هەر شێوەیەك ئەو کولو کۆیەی دامردوەتەوە و سەرگەرمێ تەمەنی لاویەتێ لە کەللەی دەرچوە و کەوتوەتە بیری گەڕانەوە بۆ لای خودا و تۆبەکردن لە کردەوەکانی رابوردوی • با لێرەدا پێکەوە هەندێك لەو شیعرانە بخوێنینەوە کە بۆنی تەمەنی لاوێ و کاتی سەرگەرمییان لێ دێت :

**بەس بێ جیلوەی زولف و خاڵان عاشقی روخساری خۆت**
**ئاڵ و واڵای خولدی ناوێ طالیبی دیداری خۆت**
**نامەوێ عەیشی جیهان ، حاشا لە فیردەوسی بەرین !**
**تۆی مورادی دین و دونیام ، نار خۆت ، ئەنواری خۆت**

پارچەی (٧) پیتی (تێ) بلاونەکراوە •

**عوشرەتی هەردوو جیهان دێنێ ( وەفایێ ) ! فرصەتە :**
**گۆشەیی گوڵزار و ، جامی بادە و ، روخساری یار**

پارچەی (٢) پیتی (رێ) بلاونەکراوە •

**ساقێ ! چاوت بنوێنە ، زوهد و تەقوام بستێنە !**
**قوربانی جامێك مەی بێ هەموو صەوم و صەلاتم**
**موطریب ! هاوی رۆحانێ ، لێدە تاری سوبحانێ**
**شاباشی سۆزەی نەی بێ هەموو جومعەو جەماعەتم !**

پارچەی (٨) پیتی (میم) بلاونەکراوە •

**ئەمن چی و زوهدی صۆفییانە ؟! من و گۆشێکی مەیخانە**
**بە قوربانی نیگاهێکت هەم و صەوم و صەلاتی من**

پارچەی (٤) پیتی (نون) ، بلاونەکراوە •

**خاڵی گۆشەی چاوەکەی فەرموی : (وەفایێ) پێت بڵێم :**
**تا نەبوومە خادیمی مەیخانە کارم چا نەبوو !**

**پەنجا**

دوای ئەم چەند نمونە با پێکەوە ئاوڕێکیش بە لای ئەم شیعرانەی خوارەوەدا بدەینەوە :

**وەفایی ! ئیدی بەسە عیشق و هەوای مەدرەسە**
**بینوسە ئەم هیندوسە ، بێتە خەط و خاڵی یار**
**بچۆ بە لای دڵڕوبای ، بە سەر بە یادی بەقای ،**
**هەتا ئەتۆ بێ وەفای بەخۆت مەکە ئیعتیبار !**
**هەزار صەوم و صەلات بێ ، چاوت لەدوی زەکات بێ ،**
**خودات نیە ، حەیات بێ ! قەط وا نیە تۆبە کار**
**تف لە رەنگ و رەوانت ، دەگەڵ فیعل و ژیانت ،**
**چی تێدا نیە دوکانت ، چت بکڕێ خڕیدار .**

پارچەی (١)ی پیتی (رێ) بڵاونەکراوە .

دەبێ ئەوە لەبیر نەکرێت (وەفایی) ماوەیەکی باش موریدی شێخی نەهری بوە ، بەڵام ئەمەیش بە شێوەیەکی رون باس نەکراوە و ، سەرچاوەی باشی ئەم مەبەستەمان بە دەستەوە نیە ، جگەلەوەی خۆی لە پارچەی (٦)ی پیتی (دال)ی بەشی فارسیدا باسی ئەوە دەکات کە ١٤ ساڵ موریدی ئەو بنەماڵەیە ــ بنەماڵەی نەهری ــ بوە .

**وەفایی و ناو و شۆرەتی لە سەردەمی خۆیدا :**

هەرچەند لە سەردەمی ژیانی وەفایی خۆیدا و ــ دوای سەردەمی خۆیشی ــ بەسەرهات و ژیانی بە رێك و پێکی نەنوسراوەتەوە تا لە عاستی ئەو نوسراوانەدا بتوانین پلە و شۆرەتی وەفایی باس بکەین ... ئەتوانین لەبەر رۆشنایی پارچە شیعرێکدا کە دۆستێکی بۆی نوسیوە [ لەوەش ئەچێ ئەو دۆستەی نازناوی (غەریقی)[٢٦] بێت ] ئەوە بڵێین کە وەفایی هەر لە سەردەمی ژیانی خۆیدا ناو و شۆرەتێکی باشی پەیداکردوە و شیعرەکانی

---

(٢٦) مامۆستا نەجمەدین مەلا لە لاپەڕە ٨٥٠ی (سۆزی نیشتمان)دا باسی ( غەریقی )یەك ئەکات لەبەر ئەوەی لە گەڵ ئەم نازناوەدا یەك ئەکەوێ وا
=

دەستاو دەست و دەماو دەم بلاوبۆنەتەوە و ، خوێندەوارانی ئەو سەردەمە پەسەندیان کردوۆن و ، شایەتیٚ چاکییان بۆ داون • ئەم پارچە شیعرە هەر لە ناو دیوانە دەسخەتەکەدا و لە رزی شیعرەکانی وەفاییدا نوسراوەتەوە • بەلام ئێمە وا لە بەر ئەم مەبەستەی ئێرە و لە بەر ئەوەیش کە شیعری وەفایی نیە ئەیگوێزینەوە ئێرە و پێش‌چاوی خوێنەری بەڕێزی ئەخەین تا خۆی حەکەمی ئەم مەبەستە بێت :

**بەهای ئەبیات و ئەشعارت (وەفایی) مولکی ئێرانە**
**نیثاری مەصرەعێکی [لایەق بیٚ کەی!] دۆصەد جانە ؟**
**عیراق و پارسی وا گرتەوە خۆ لەشکری نەظمت**
**ئەوا دەڕوا لە بۆ تەسخیری مولکی هیند و تۆرانە**
**ئیلاهی با دڵی خوڕڕەم دەگەڵ زومرەی رەفیقانت**
**بەخێر و شادی رەجعەت کەی کە ئێران بیٚ تۆ وێرانە**
**مورادت (کعبة الله) یە مەرامت حەضرەتە لێکن :**
**حەقیقەت مەطلەبە ، ئەصلی ویصالی وەصلی جانانە**
**خودا هەمڕاهی تۆ بیٚ ، دەستگیرت (غەوثی ثانی) بیٚ،**
**طەریقێکی خەطەرناکە کە : رەهزەن نەفس و شەیطانە**
**ئەمن خاکی سەگی غەوثم فەرامۆشم مەکە قوربان !**
**لە هیجرت ئاوری بەربۆتیٚ دەروۆنم ، وەك نەیستانە**
**هەزاران موژدە بیٚ ، ئەی بولبولی شەیدا ، (بحمدالله)**
**لە نەسلی ئالی (طه) ، (غەوثی ثانی) ، شاهی شێخانە**
**لە سایەی غەوثی ثانی دامەنم پڕ دوڕڕی شەهوارە**
**بەهای هەر دانەیێکی ، بیٚ شکە ، تەختی سولەیمانە**
**ئەگەر ئەحواڵی کەلبی خۆت دەپرسیٚ، شاهی شەمزینیٚ**
**هەمیشە : چاو بە خوێنە ، دڵبریندار و ، پەرێشانە**

---

=

نوسراوەکەی بۆ خوێندەواران دێنمە ئێرە . بەلام هیچ بەلگەی ئەوەیشم بە دەستەوە نیە کە لە گەڵ غەریقیٚ لای وەفاییدا یەك بن :

« غەریقیٚ ناوی فەقیٚ محەممەد بوە خەڵکی گوندی (وەڵدانە)ی ئەودیو چیای گۆیژەیە ، عەسکەریٚ تورکی کردوە ، بوە بە چاوەش ، لە پاشا بوە بە (ضابط) ، لە گەڵ شاعیر (خاکیٚ)دا شەڕە شیعری کردوە بە فارسیٚ ، ساڵی ١٩٢٥ بە رەحمەت چۆ ... » .

**دەگەڵ ئەم بەندەیە حاجی (وەفایێ) بۆچی بێ لوطفی ؟**
**ئەگەر چی بێ خەطایە خۆ سەگی دەرگاهی شاهانە !**

**لە لوطفی خۆت دەپرسی گەر لە حاڵی بەندەیی کەمتر**
**غەریقە هێندە گریاوە (غەریقێ) بەحـری عوممـانە !**

**کۆچی دوایی وەفایێ :**

بۆ دۆزینەوەی ساڵی کۆچی دوایی وەفایێ ئەبێ بەراوردێك لە نێوان ئەو نوسینانەدا بکەین ، کە لە سەر وەفایێ نوسراون و دەقەکانیانمان پێشکەش کردن • بە گوێرەی نوسینەکەی (ژین) وەفایێ ساڵی ١٣٢٠ی ك ی ١٩٠٢ی زی لە جیهاندەرچوە و ، بە گوێرەی نوسینەکەی مامۆستا نەجمەددین مەلا دوای ساڵی ١٣١٨ ك ی ١٩٠٠ز ی لە جیهان دەرچوە • وە بـە گوێـرەی نوسراوەکەی کاك محەمەد رەسوڵ هاواریش ساڵی ١٨٩٩ز ی لـە جیهـان دەرچوە و سەرچاوەی ئەم باسانەیش ــ جگە لە نـوسراوەکەی ژین کە بێ سەرچاوەی دیاری کراوە ــ مامۆستا پیرەمێردە کە لە گەڵ وەفاییدا بـوە کاتێ لە جیهان دەرچوە و ئەم سێ باسە لە یەکەوە نزیـکن ، بـەڵام تێکڕا لەوەوە دورن کە لە چاپەکانی گیو و سەیدیاندا ئەڵێن : وەفایێ لە سـاڵی ١٩١٤زیدا لە جیهان دەرچوە •

ئەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە روداوی کۆچی دوایی شـێخی نەهرێ کە ساڵی ١٩٠٠زی بوە هەندێك گومان ئەخاتە نوسراوەکانی (مینای شکستە) و (پیرەمێردی نەمر) ؛ چونکە وەفـایێ دوای کۆچی دوایی شـێخی نـەهرێ شینێکی بۆ شێخ نوسیوە و شێخی لاواندوەتەوە • خـۆ بەم حیسـابانە کە هەردوکیان لە یەك ساڵدا لە جیهان دەرچون باسەکە بێ گومان نابێ ، مەگەر شێخ پێش وەفایێ لە جیهان دەرچوبێ و وەفـاییش شـینەکەی بۆ کردبێ و دوابەدوای ئەو مردبێ • بەم پێیە رەنگە شینی شێخی نـەهرێ دوا پارچـە ــ یان لە پارچە دواییەکانی ــ شیعری وەفایێ بێ •

ئەبێ دۆبارە ئەوە لەبیر ئەکەین کە خەوبینین و کاغەزنوسین و جـۆرە باس و موناسەبەیەك لە گەڵ پارچەی شینی شێخی نەهرێدا هەیە ــ جـگە لەوەیش کە وەفایێ لە بەشی فارسییەکەشدا شینی شێخی بە فارسێ کردوە و، وەك کوردییەکەی وایە ــ ئەوە دیاری ئەکەن وەفایێ ئەو پارچە شیعرەی لە سابلاغ‌وتبێ • واتە ئەگەر بیر لە نارەحەتێ سەفەری ئەو کاتــە و نــەبونی کەرەستەی گورجی هاتوچۆ بکەینەوە ئەبێ وەفایێ ئەو ساڵە نەچوبێ بـۆ حەج و هیچ نەبێ ساڵێ دوای ئەوە مردبێ • واتە ئەبێ نوسینەکەی (ژین) کە ئەڵێ : ساڵی ١٣٢٠ ك ی ١٩٠٢ زی وەفایێ لە جیهـان دەرچـوە زیـاتر لە راستییەوە نزیـك بێ •

**وەفایێ لە کوێ مردوە ؟**

بە گوێرەی هەمو نوسراوەکان گومان لەوەدا نیە کە وەفایێ لە رێگەی حەج مردوە بەڵام لە چ جێگەیەکی ئەو رێگە دور و درێژەدا مردوە ؟ ئەمەیان جێگەی باس و گومانە ؛ بە گوێرەی نوسراوەکەی ژین و چاپەکان وەفایێ لە دەشتی شام لە جیهان دەرچوە • وە بە گوێرەی قسـەکەی مامۆسـتای سنجەرێ ــ کە لە پەراوێزدا نوسیم ــ لە ئوحود لە جیهـان دەرچوە • وە قسەکانی پیرەمێرد تەنها لم و چۆلی عەرەبستان دیاری ئەکەن •

**بەشی فـارسێ :**

لە سەرەتاوە و تا کاتێکیش هەمو بەشی کوردێ ئەم دیوانەم ئـامادە کردبو لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە هیچ خۆم بە بەشی فارسییەوە خەریك نەکردبو و بڕیاری ئامادەکردنیشیم نەدابو :

١ــ خۆم فارسێ باش نازانم و شارەزاییەکی ئەوتۆم لە ئەدەبی فارسیدا نیە کە پشتی پێ ببەستەم و خۆم لە قەرەی کاری وا بدەم •

٢ــ بەشی فارسییەکەی زۆر لە بەشی کوردییەکەی پەرپوت و تەزبو و ویران ترە •

٣ــ هیچ کەشکۆڵ و سەرچاوەیەکی ترم دەست نەکەوت یارمەتیم بۆ راستکردنەوەی ئەم بەشە بدات •

٤ــ بە رای هەندێ لە فارسیزانان و ئەدەبدۆستان پلـەی شـیعرە فارسییەکانی زۆر بەرز نین و ناگەنە پلەی شیعرە کوردییەکانی •

بەلام هەر چەند سەیری بەشی فارسییەکەم ئەکرد ، بیرم لەوە ئەکردەوە کە بلاوکردنەوەی دیوانەکەی بێ ئەم بەشە کەمێ و نـاتەواوێ پێوە دیـار ئەبێ، بۆیە جارێکی تر سێ و دوی دلی خۆم کرد و پیشانی چەند مامۆستایەکم دا ••• رای زۆریان ئەوە بو هەرچۆن هەیـە نابێ ئەم بەشـە پشـت گوێ بخرێ و رێگەی لەناوچونی بدرێ ؛ چونکە ئەم شیعرە فارسییانە بەشـێکی ترن لە ئەدەبی وەفایێ و ئاوێنەی رونکردنەوەی بارێکی تری هونەری ئەو شاعیرەن و ئەم هەلە لەکیس بچێ لەوانەیە ئەو بەشە لەناو بچێ •

بۆیە منیش لەبەر ئەم رایە و پشت بە یارمەتیێ ئەو مامۆستایانە و چەنـد دۆستێك قۆلم لێ هەلمالی و هاتمە سەر نوسینەوە و ئامـادە کردنی ئـەم بەشەیش •

بەلام ئەو داخەم ناچێ کە بە ئەوپەڕی هەوڵ و کۆششی خۆم و ئـەو مامۆستایانەیش هێشتا نەمانتوانی بگەینە راستکردنەوەی هەمو شیعرەکان و گەلێ جێگەی بە بۆشی مایەوە [٢٧] •

سەبارەت بە ساخکردنەوەی شیعرەکان بە گوێرەی توانا هەولم داوە

---

(٢٧) مامۆسـتـایان زەبیحێ و ، عەبدوللا حەسـەنزادە و ، صـەلاحەدین سەنگاویێ ، بۆ سـاخکردنەوەی ئەم بەشە زۆریان یارمـەتی دام . خوا وێنەیان زۆر کات ! .

بۆ ئەوەی بە راستی بیاننوسمەوە ، ئەگەر شیعرەکەم تەواو بۆ راست بوبێتەوە ئەوا بە تەواوی نوسیومەتەوە ، ئەگەر جێگەیەکی لەبەر تەڕبون و کوژاوەیی بۆم نەخوێندرابێتەوە ئەوا ئەو بەشەم بە بۆشی هێشتوەتەوە و ، نوختەم لە جێگەی داناوە • وە ئەگەر وشەیەك لە لایەن نوسەرەوە بە هەڵە نوسرابێ لە پەراوێزەوە دەس‌نیشانی ئەکەم ، مەگەر هەڵەکە زۆر بچوك و دیاری بێ وەك نوختە و شتی وا ، ئەوەم بە پێویست نەزانی باسی لێ بکەم رێگەی چاككردنیم بە خۆم دا •



# پێڕستێکی پارچە شیعرەکانی دیوانی وەفایی

بەو جۆرەی لە دەسخەتەکەدا نوسراونەتەوە :

**١ـ بەشی فارسی :**

| نیوە شیعری یەکەمی هەر پارچەیەك | لاپەڕە |
|---|---|
| ١ ــ این تطاول بین که از دست شب یلدا کشم [٢٨] | ١ |
| ٢ ــ نمیدانم چرا ای دیده چندین خون فشان هستی ؟ | ٢ ، ٣ ، ٤ |
| ٣ ــ دوش اندر میکده چون وجه زیبا زدند | ٤ ، ٥ ، ٦ ، ٧ |
| ٤ ــ ندانم با وفاداران جفاکاری چرا کردی ؟ | ٧ ، ٨ |
| ٥ ــ کرم خواندی ، ستم راندی ، وفا گفتی ، جفا کردی | ٨ ، ٩ |
| ٦ ــ ای روی تو ابروی تو وان دو لب شیرین | ٩ |
| ٧ ــ السلام ای باغ رویت جنةالمأوای من | ٩ |
| ٨ ــ هم چو شاهین بهوس بال پرم بگشادم | ١١ |
| ٩ ــ در هر دو جهان گر اثر عشق نبودی [٢٩] | ١١ |
| ١٠ــ زد صفیری مرغ جان بالای عرش | ١٢ ، ١٣ |
| ١١ــ جان نثار قبله ابروی عشق | ١٣ ، ١٤ |
| ١٢ــ کای نسیم منزل جانان من | ١٤ ، ١٥ ، ١٦ |

(٢٨) ئەم پارچە شیعرە پارچەی یەکەمی بەشی فارسییە و سەرەتاکەی ناتەواوە .

(٢٩) لەم جێگەدا پەڕەیەك ــ یان زیاتر ــ ی بەشی فارسی کەوتوە .

| نیوه شیعری یەکەمی هەر پارچەیەك | لاپەڕە |
|---|---|
| ١٣ـ شانه کن زلف سیاهش با ادب | ١٦ ، ١٧ |
| ١٤ـ نی غلط گفتم که خورشید هداست | ١٨ ، ١٩ ، ٢٠ |
| ١٥ـ فدای جان پاکت این غلام دربدر کرده | ٢٠ ، ٢١ |
| ١٦ـ ای بمصر سودایت صد عزیز قربانی | ٢١ |
| ١٧ـ عبیدالله رئیس مرشدان توهم ••• لها (٣٠) | ٢١ ، ٢٢ |
| ١٨ـ دلبر دارم که در عالم نظیرش کمتراست | ٢٣ |
| ١٩ـ ای ترك خطا ماه ختن سرو خودآرا | ٢٢ ، ٢٣ |
| ٢٠ـ بخیال تو بهر جای که من می‌نگرم | ٢٣ ، ٢٤ |
| ٢١ـ گر من سوخته بر شاهد خوبان برسم | ٢٤ ، ٢٥ |
| ٢٢ـ براه دوست کسی سر نهد سبك باراست | ٢٥ |
| ٢٣ـ بی تو ای دوست ندانم که چگویم ، چونم ؟ | ٢٥ ، ٢٦ |
| ٢٤ـ کشیده طره سراز اختیار عارض قامت | ٢٦ ، ٢٧ |
| ٢٥ـ خطا گفتم که زلفت مشك چین‌است | ٢٧ |
| ٢٦ـ نگار نسیم دل و جانم حبیبم | ٢٨ |
| ٢٧ـ گفتم به بت ساده : که ای ترك خجندی | ٢٨ |
| ٢٨ـ یار ارمنی مذهب ، شوخ عیسوی ملت | ٢٨ |
| ٢٩ـ بت من طره چو بر برگ سمن برشکنند | ٢٨ ، ٢٩ |
| ٣٠ـ آن شکرخنده بوصل دهنم شاد نکرد | ٢٩ ، ٣٠ |
| ٣١ـ بکوی یار هردم از فراق یار مینالم | ٣٠ |
| ٣٢ـ بفریادم رس ایجان عزیزان لعل شرینت | ٣٠ ، ٣١ |
| ٣٣ـ دریغ عهد گل و عاشقی و روز جوانی | ٣١ |
| ٣٤ـ ای راحت دل قوت روان لعل لبانت | ٣١ ، ٣٢ |
| ٣٥ـ مرا تحیر از آن زلف و روی نرگس مست‌است | ٣٢ |

| نیوه شیعری یەکەمی هەر پارچەیەك | لاپەڕە |
| --- | --- |
| ٥٩ــ خوش همی غلطو برویش طرهٔ پرپیچ و تاب | ٤٥ ، ٤٦ |
| ٦٠ــ ای بیادات عاشقان‌را هر نفس | ٤٦ |
| ٦١ــ بر دل و بر دیده گفتم هر کجا خواهی بیا | ٤٦ ، ٤٧ |
| ٦٢ــ شانه زد بر روی خود خون طره و لاله‌را | ٤٧ |
| ٦٣ــ ز دست خود مده ای دیده یاد زلف مشکین‌را | ٤٧ ، ٤٨ |
| ٦٤ــ زلف مشکین بین که بر عارض پر پریشان کرده‌است | ٤٨ |
| ٦٥ــ شب‌است این زلف یا روز جدایی ؟ | ٤٨ ، ٤٩ |
| ٦٦ــ خوشا روزی ز دنیا در بدر بم | ٥٠ |
| ٦٧ــ جز سر زلف تو دل که راه ندارد | ٥٠ ، ٥١ |
| ٦٨ــ گر کاینات نامه شود صد هزار بار | ٥١ |
| ٦٩ــ ای خم زلف سیاه تو جنابش مستطاب | ٥١ ، ٥٢ |
| ٧٠ــ طره از باد وزان لرزان بروی دلبر مااست | ٥٢ |
| ٧١ــ ای رخ و زلفت شب تاریك روز روشن‌است | ٥٢ |
| ٧٢ــ ای فتنهٔ عالم به نگاه این چه جمال است | ٥٣ |
| ٧٣ــ ای بت چین ای بلای جان خط و خالت | ٥٣ |
| ٧٤ــ ای انکه خطت سبز و لبت آب حیات‌است | ٥٣ ، ٥٤ |
| ٧٥ــ آن روز کز آن طره برخ بست شکن‌را | ٥٤ |
| ٧٦ــ بشکست چو زلف سیه مشکفشان‌را | ٥٥ |
| ٧٧ــ بتم بر طلعت خود شانه زد زلف چلیپارا | ٥٥ ، ٥٦ |
| ٧٨ــ حلقه زد چون دردی زلفا رخ جانان‌را | ٥٦ |
| ٧٩ــ دلی دیوانهٔ دارم دمی بیغم نخواهد شد | ٥٦ ، ٥٧ |
| ٨٠ــ مستانه چو از میکده بیرون آید | ٥٧ |
| ٨١ــ دو هفت سال ریاضات خاك شمذینان | ٥٧ ، ٥٨ |

## ٢ـ بەشی کوردیێ :

| لاپەڕە | نیوە شیعری یەکەمی هەر پارچەیەك |
|---|---|
| ٧٥ ، ٧٦ | ٩ ـــ گۆلێکم بۆ لە دونیادا شکۆفەی باغی رەعنایی |
| ٧٦ | ١٠ ـــ ئەی صەبا تێك مەدە تۆ پەرچەم و کاکۆڵی گوڵە |
| ٧٦ | ١١ ـــ بە ماچێ جان دەبەخشی ئەی مەسیحای عەصرە بیستومە |
| ٧٧ | ١٢ ـــ تا خەندەی گوڵ کاشیفی ئەسراری نیهانە |
| ٧٧ ، ٧٨ | ١٣ ـــ ئەی دڵ وەرە هۆشیار ببە هذا طریق العاشقین |
| ٧٨ ، ٧٩ | ١٤ ـــ فەرمۆیە کە من پادشاهی حوسنی دڵئارام |
| ٧٩ ، ٨٠ | ١٥ ـــ کاکۆڵی بە دەم باوە کە بادا بە بەدەندا |
| ٨٠ ، ٨١ | ١٦ ـــ گوڵەندام ئەی طەنافی گەردەنم زولفی پەرێشانت |
| ٨١ | ١٧ ـــ نیگارا دولبەرا نامیهرەبان یاری جەفاکارم |
| ٨٠ ، ٨٢ | ١٨ ـــ غەمزەدەی زولفم بە غەمزەی چاوی حەیرانم دەکا |
| ٨٢ | ١٩ ـــ بە یادی زولفتە ئارامی رۆح و راحەتی جانی |
| ٨٢ ، ٨٣ | ٢٠ ـــ شەهیدی خەنجەرت ئەو رۆژە عومری جاویدانی بۆ |
| ٨٣ | ٢١ ـــ هەر کە دی جەننەت بە رودا زولفی پڕتابی شکا |
| ٨٣ ، ٨٤ | ٢٢ ـــ حەریفان ئەلئەمان کوشتومی یارم ، چاوی بیماری |
| ٨٤ | ٢٣ ـــ گەردشی چاوت قەراری عاشقی میسکین دەبا |
| ٨٥ | ٢٤ ـــ لەو شارە خەدەنگی صەنەمێکم لە جگەر دا |
| ٨٥ ، ٨٦ | ٢٥ ـــ لە سەر رۆت کاذیبەی زولفت وەلابە |
| ٨٦ | ٢٦ ـــ حەلقەی سەری زولفت لە دۆلا چەتری عوزارن |
| ٨٦ ، ٨٧ | ٢٧ ـــ لە داغی زولفی یار و عاریضی وەك لالە سۆتاوم |
| ٨٧ | ٢٨ ـــ قەد گوڵ و رۆ گوڵ و دەمانی گوڵە |
| ٨٧ ، ٨٨ | ٢٩ ـــ ئەی لە سایەی سەری زولفت بە نیگاو و خەطط و رۆ |
| ٨٨ | ٣٠ ـــ تابی سەری کولمت بۆ کەوا زولفی بە با دا |
| ٨٨ | ٣١ ـــ سەرگەشتە و شێواوە وەکو سایە لە دۆتە |

# پێڕستێکی پارچە شیعرە بڵاونەکراوەکانی دیوانی وەفایێ

١٦ــ بۆ هەوایی زولف و دڵ چاکم لە ڕوی جانانە بۆ
١٧ــ ئەی لە سایەی سەری زولفت بە نیگاو و خەطط و ڕۆ
١٨ــ ئەی جەننەتی عەیشی ئەبەدم ڕێگوزەری تۆ
١٩ــ پەنجەی لە حەنا بەستوە ــ ئایا ــ گوڵم ئەمڕۆ ؟
٢٠ــ بە لێوی تۆ بە چاوی تۆ کەوا هەر مەست و سەرمەستە
٢١ــ سەرگەشتە و شێواوە وەکو سایە لە دوتە
٢٢ــ ئەرێ ئەی زولفەکەت سەر تا قەدەم هەر حەلقە و بەندە
٢٣ــ تۆ سەری زولفی بڵاوت زولفی خاوت با مەدە
٢٤ــ دولبەرا تۆبی و سەری زولفت بە عاریض وا وەرە
٢٥ــ ئەی خۆش‌خەبەر نەسیمی سەحەر پەیکی عاشقان
٢٦ــ قەد گوڵ و ڕۆ گوڵ و دەمانی گوڵە
٢٧ــ ڕۆژی طەرەب و کەیف و دەمی جۆنی کوتانە
٢٨ــ چین چین و تا تا [سەری !] زولفی حەریری بکەوە
٢٩ــ چاوەڕێی موژدەی نەسیمم تا لە گوڵشەن دێتەوە
٣٠ــ ئەرێ حەبیبی ڕەوانم طەبیبی دەردی جودایی
٣١ــ تا نێرگسی تۆ نازی هەبێ غەمزە نومابێ
٣٢ــ شەرحی دەردی ئارەزۆمەندێ لە کەس تەئثیری نابێ
٣٣ــ زەدەی ڕۆتم ، بە چاوی تۆ ، شیفام بێ لێوەکەت نایێ
٣٤ــ ئەمان موطریب بێ ساقێ وا بێ
٣٥ــ سۆتام بە نازی فیرقەتێ ساقێ کەرەم کە شەربەتێ
٣٦ــ کە شانەی دا لە زولفی تار و ماری
٣٧ــ ئەی غەزالانی خەطا ، ئاهوی چین کەبکی دەرێ
٣٨ــ یارم کە قەدی بەرزی صەد نەخلی شەجەر دێنێ
٣٩ــ ئەگەر چی بادی نەورۆزێ نەویدی وەصڵی گوڵ دێنێ

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

# پیتی ئەلف

(١)

گەردشی چاوت قەراری عاشقی میسکین دەبا
ساحیری چاوبەستە ، ئارێ ، دڵ دەکێشێ دین دەبا ؟
قیبلەکەم بەو زاری هەر وەك غونچە بۆیە پێکەنی
دا بڵێن خەندەی لە گوڵ دێ ئابڕۆی پەروین دەبا
من کوتم : گرتی حەبەش کەعبەی جەمالت ! ئەو دەڵێ :
کاروانی میشکە بۆ شارێ گوڵ و نەسرین دەبا
گەر ببینێ طاقی پەیوەستی برۆت فەرهادی چین
ڕۆحی شیرینی بە قوربانێ بە صەد ناڵین دەبا
پێچ و تاوی زولفی خاو و ، ڕەمز و غەمزەی سیحری چاو
ئەو لە لایێ ڕۆح دەکێشێ ئەم لە لایێ دین دەبا
نەشتەری چاوی حەبیبم دێ بە سینەمدا دەچێ
مەرهەمی نازی طەبیبم بۆ دڵی خوێنین دەبا
من وەها مەستی گوڵەندامم کە نازانم ئەبەد :
هۆشی من دوگمەی تەڵا ، یا ساعیدی سیمین دەبا ؟ (١)

---

(١)

(١) ئەم شیعرە لە (خ)دا نیە ، لە ( هـ ) وەرگیراوە .

تا ( وەفایی ) لەو دەرە بێت و بچێ مەنعی مەکە
سورمەیی خاکی دەرت بۆ چاوی پڕ ئەسرین دەبا

( ٢ )

سەری کوڵمت لەنێو زولفی سیادا
ئیشارێکە لە نوری شەوچرادا
سوجودی بردە ئەبرۆت رۆژ لەسەر رو
شەوی دینی کەتۆ زولف[١] وەلادا
ئەمن چاوم لە رۆژ وا پڕ لە خوێن بو
کە ئاوێنەی جەمالی خۆی جەلادا
شەو و رۆژ هەر لەفیکری زاری[٢] تۆدام
بە هیچێ عومری شیرینم بەبادا
ئەرێ روحم بە لێوی پڕ لە خەندەت
ئەرێ هۆشم بە چاوی سورمەسادا [٣]
لە بەر طاقی برۆت بمرم چنابێ
کە من شابم لە بن باڵی هومادا[٤]
مورادی روحمە بۆیە ( وەفایی ) !
بە دڵ ماچێ لە غونچەی لێوی نادا

---

( ٢ )

(١) (زوڵف) دەبێ وەکو (زوڵفت) بخوێنرێتەوە .

(٢) ( زاری ) دەگونجێ مەبەست لە (زار) دەم بێ ، دەشگونجێ (فیکر و زاری) بێ ، واتە : لە بیرکردنەوە و شیوەن و زاری تۆدام .

(٣) سورمەسا : بە کل رێژراو .

(٤) هوما : پەلەوەرێکی ئەفسانەیی‌یە دەڵێن سێبەر بەسەر هەرکەسەوە بکا دەبێ بە پادشا .

( ٣ )

تابی سەری کوڵمت بۆ کەوا زولفی بە بادا
یا ڕۆژی ویصالت شەوی هیجرانی وەلادا ؟
خاڵی دەمتە یا مەگەسی حوققەیی[1] شەککەر
یاخۆ حەبەشیزادە لەنێو ئابی بەقادا ؟
خوێنین جگەرن طالیبی ئەو زارە دو عالەم
ئەو جەوهەرە بۆ هیچە بە دوو عالەمی نادا
هەر تارە کەوا مەسکەنی بارێ دڵ و ڕوحە
صەد ڕوحی بە بادا کە بەداو پەرچەمی بادا
بازاڕی شکا وەك دڵی زارم گوڵ و نافە
تاتا سەری زولفی کە بەسەر عاریضیدا دا
[ ئەو زارە کەوا هەر بە تەبەسسوم هەیە خاڵێ ]
[ پیرێکە دەڵێ گا لە بەقا گا لە فەنادا ]
حیرەتزەدەیی[2] نێرگس[3] و ئەبرۆتە ( وەفایێ )
کافر نیە وا مەست و لە میحرابی دوعادا

---

( ٣ )

(١) مەگەسی حوققە : مەگەس: مێش. حوققە : قوتوی بچوکی جەواهیرات و شتی بەنرخ ، نازانم مەبەستی وەفایێ لە تێکڕای ( مەگەسی حوققە ) چیە ! دەگونجێ خاڵێك بەلای لێوی خۆشەویستەکەیەوە بوبێ ، ئەو خاڵەی شوبهاندبێ بە مێش و ، دەمی خۆشەویستەکەی بە قوتوی جەواهیرات و ددانەکانی بە شەکر .

(٢) حیرەت زەدە : سەر لێ شێواو .

(٣) نێرگس : لێرەدا مەبەستی چاوە .

( ٤ )

( بیا ای جان من ساقی فدای ساغرت بادا ) [١]
ئەمان سۆتام ئەمان جامێ لە نۆبەی دەورە بەملادا
( هوا خود نافه میریزد صبا مشك ختن بیزد ) [٢]
مەگەر دیسا بە دەم بادا حەبیبم پەرچەمی بادا
( گدا و بزم شاهان ، ما و وصل دوستان ، هیهات ! ) [٣]
لەبەر وەی ئارەقی کولمی لەباتی مەی بە مەی نادا
( پریشان کرد چون بر چهره دو زلف عنبرین گفتی : ) [٤]
بەهارێك سونبولی تاتار بە بارێك یاسەمەندادا
( عرق بر گردن ، خط بر عذار ، خنده در لعلش ) [٥]
دەڵێی شەکەر لەمەڕ عەنبەر لە گەڵ ئارەق لە مینادا
( بچشم اشکبارم عکس روی و موی جانان بین ) [٦]
شەو و ڕۆژ ڕۆژ و شەو هەردۆ لە نێو عەقدی ثریادا
( بهاری بوسهء ناکرده جان باشد بچشم اما ) [٧]
دەمت وا بێنە ــ چاوم ــ قەد بوە گەوهەر لە دەریادا ؟!

---

( ٤ )

(١) وەرە ئەی ساقێ گیانی من فیدای پیاڵەکەت بێ .
(٢) هەوا نافە دەڕژێنێ ، صەبا شتێك دێنێ موشکی خۆتەن دەبێزێنێ .
(٣) گەدا و بەزمی پاشایەتێ ؟ ئێمە و گەیشتن بە دۆستان ؟ زۆر دۆرە !
(٤) کاتێ زوڵفی عەنبەرینی بە سەر ڕۆدا بڵاوکردەوە وتی : .
(٥) عەرەق لە گەردەن و خەط لە زوڵف و خەندە لە لێودا .
(٦) بە چاوی فرمێسکاویم عەکسی ڕۆ و مۆی گیانان و (دولبەران) ببینە .
(٧) نرخی ماچی نەکەردە گیانە بەچاوی ئێمە .

ئەم نیوە شیعرە لە (خ)دا بەو شێوەیە کە نۆسیمان ، بەڵام لە (ھ)دا (بهای) و (چشم‌ما)یە و ئەمەش لە ڕاستیەوە نزیکترە ؛ بۆیە وایش مانامان لێكدایەوە .

( فغان و گریهء دل از غم روی تو در زلفت )[8]
دەڵێی بۆ گوڵ دەناڵێ شەو لە نێو بولبول لە صەحرادا
( « وفایی » ! تا منم گریان و سوزان در پی یارم )[9]
تەمەننام هەر لە یارە گەر بە ئاو و ئاورمدادا

**( ٥ )**

هەر چی لە سەر تۆ گەڕا شا بۆ بە دەولەتی ڕۆت
زولفی شکستە بۆیێ دەستی لە دامەنت دا
صەد ڕۆح ئەگەر فیدا کەم ناگەم (١) بە خەت و خاڵت
من نائومێد و مەحرۆم هیندۆ لە گوڵشەنتدا
زولفت لەپێ کەت(٢) و خەط هات بە تەمای قەتلی دڵ
ئاخر بە دەستخەطی خۆت گرتت بە کوشتنت دا
ئەی نەوبەهاری خۆبێ ڕوحمێ بە حاڵی بولبول
نەوەك سەرمای هەناسەی لە گوڵ و یاسەمەنت دا
ئەی خەط بە زولفی دولبەر تۆ بویە فیتنەیی دڵ
دڵ بێ غەم و خەیاڵ بۆ هاتی بە گرتنت دا

---

(٨) شیوەن و گریانی دڵ لە غەمی ڕۆی تۆ لە زوڵفتا ...
(٩) (وەفایی) تامنم و من هەم گریان و سۆتانم هەر بۆ یارە ...

**( ٥ )**

(١) (ناگەم) بە (ناکمە = ناگەمە) نۆسراوە ، بەڵام دیارە هەڵەیە و کێشەکەیش لەنگ دەبێ ؛ بۆیە دەبێ یان (ناگەمە خەت و..)یان (ناگەم بە خەت و..) ، وەك دەشگونجێ (ناگەمە بەختی خاڵت) بێ ؛ چونکە ڕێنۆسی دەسنۆسەکە بەم جۆرەیە : «ناکمە بخت خالت» .
(٢) (کەت) لە دەسنۆسەکەدا (کەوت) نۆسراوە ، بەڵام بەم جۆرە سەنگی شیعرەکە تێك دەچێ ، لە بەر ئەوە و لە بەر هاوسەنگێ لە گەڵ (خەت) و لەبەر ئەوەش هەندێ جار (کەت) بە کار دەهێنێ لامان وا بۆ ڕاستەکەی (کەت)ە . ئەم نیوە شیعرە تێکڕا لەنگێ تریشی تێدایە .

وا تێ مەگە عەزیزم کوشتمت[٣] و نائومێد بوم
دەستم ئەگەر نەگەییێ خوێنم لە گەردەنت دا
بە قسەم بکە ( وەفایێ ) بمرە هەتاکو ماوی
وەصلی بەقا بە ئایات ئەوا لە مردنتدا

(٦)

لەو شارە خەدەنگی صەنەمێکم لە جگەردا
شۆخێکە غەمی ئایینە داری بە قەمەردا [١]
خەملیوە وەکو گوڵ بەسەر و بەرگی بەهاری
خۆی گوڵ دەمی گوڵ ( چەبکەن )ی[٢] گوڵناری لەبەردا
بۆ ذەوقی تەکەللوم[٣] کە دەمی هاتە تەبەسسوم[٤]
خەندەی لەدەمی غونچە و طەعنەی لە شەکەردا
شەڕیانە لەسەر موڵکی دڵم غەمزە و و نازی
بۆیێکی بە جوت دێن وەکو نەشتەر لە جگەردا [٥]
گەنجینە طەلیسمی هەیە بەو چاوە لەسەر هیچ
وەجهی چیە ئاشوفتەیە زولفی[٦] لەکەمەردا ؟

---

(٣) (کوشتمت) لە دەسنوسەکەدا (کوشمت) نوسرابو ، بە هەڵەم زانی .

(٦)

(١) غەمی ... (ح) غەم ئاوێنەی داری لە قەمەردا .

(٢) چەبکەن (ح) چکەن . چەبکەن راســتە و چەبکەن : جـۆرە پۆشاکێکە ئافرەت لەبەریان کردووە و لە لای چەپەوە داکەنراوە .

(٣) تەکەللوم : قسەکردن .

(٤) تەبەسسوم : زەردەخەنە .

(٥) بۆیێکی (ح) بۆیێکە .

(٦) زولفی (ح) زولفت .

تیرت کە قەراری جگەرم بۆ وە دڵم کەوت
تا رۆژی حەشر داغی خەدەنگت لە جگەردا[٧]
ناڵێکە هەمە وەقفە لە شەوقی سەری کوڵمت
عومرێکە هەمۆ صەرفە لە ناڵینی سەحەردا
هەر لەحظە ( وەفایی ) وەکو بولبول کە دەناڵێ
کەس مەنعی نەکا عەشقی ( گوڵەندام )ی[٨] لەسەردا

( ٧ )

مەششاطە[١] کە شانەی لەسەری زولفی صەنەم دا
ئاشفتەگی‌یی[٢] حاڵی ( وەفایی ) لە قەڵەم دا
قوربان وەرە سەیرێکی دڵ و عالەمی دڵ کە
هەر زەوقە بەدڵ ، شەوقە لەسەر ، ئاهە لە دەمدا
ئاوێنەیی دڵ وا لە جەلادا[٣] بە تەجەللی[٤]
دێوانەیی رۆت کەی لە هەوای شەوکەتی جەمدا ؟!
بۆ خاطری خەندێکی بە رەنگی گوڵ و باران
عاشق ئەوەتا هەر کوڵی گریانی لە دەمدا

---

(٧) ئەم پارچە لە (ح) و (ن)دا ناتەواوە و شەش شیعرە ، جیاوازی (ح) و (ن) وەك یەك وایـە .

(٨) گوڵەندام : خۆشەویستی وەفایی بوە و ، ئافرەتێکی جوان و ناسراو بوە و، وەفایی لە گەڵی شیعردا ناوی دەبا .

( ٧ )

(١) مەششـاطە : ئەو کەسـەی سـەر شانە دەکات .

(٢) ئاشفتەگی : پەرێشانی و پەرێشـان حاڵی .

(٣) جەلا : رۆناکی و جوانی .

(٤) تەجەللی : بەرزی و شـەرەف .

خەندەی گوڵی زارت کە نەبۆ باعیثی مەستیم [٥]
بۆچی دڵی من دەستی لە گوڵزاری ئیرەم دا ؟
ئاخر سەگی خاکی دەری تۆ بۆم بە جودایێ
مروەت نەبو تیغت لە سەری صەیدی حەرەمدا
رۆحم بە نیثاری[٦] قەدەمت ! بۆچی دەڕەنجێ ؟
رۆحم کە بەمن بایە ، وەکو دڵ ، چییە ؟ دەمدا !
وا عاشقی زار و کەمەری تۆیە ( وەفایێ )
لەو نێوە وجوودێکە لە بەینی دو عەدەمدا

## ( ٨ )

کاکۆڵی بەدەم باوە کە بادا بە بەدەندا[١]
بازاڕی شکا نافە بەسەر چین و خوتەندا
تورکانە گوڵم پەرچەمی کەوتۆتە عوزاری [٢]
وەك سونبولی[٣] ئاشفتە لەبەر بەرگی سەمەندا [٤]
تا هەوری بەهاری نە بزۆت غونچە نە پشکوت
بۆیە دەگرێ خەندە بە سەر گریەیی مندا

---

(٥) مەستیم : لە (خ) دا بە هەڵە (مستم) واتە : بێ نوختەی ( ی ) نوسراوە ، بەڵام هەڵەیــە .

(٦) نیثار : رژاندن و پەخش‌کردنەوە . مەبەست شتێکە ؛ وەك نوقڵ و شەکر و خورمــا لە کاتی هــاتنی دۆســت و خۆشــەویســتدا هــەڵدەدرێت و دەبەخشرێتەوە .

( ٨ )

(١) بەدەندا : بە هەڵە لە (خ) دا (بەندەندا) نوسراوە .

(٢) عوزاری : عوزار ، کە بە شێوە نوسینی کۆن ئاوا (غــداری) بنوسرێت ، هەڵدەگرێ (عوزاری) بێ و هەڵیش دەگرێ (غەدداری) بێت .

(٣) سونبول : جۆرە گیایەکی بۆن خۆشە .

(٤) سەمەن : گوڵێکی جوانی بۆن خۆشە .

گۆیا وەکو من بەو قەدە سەودایییە زولفت
سەرگەشتەیە وا تا بەری پێت چین بە شەکەندا
[ من کوشتە ئەتۆ بەو دەمە شیرینە مەسیحم ]
[ من تەشنە[٥] ئەتۆ ئابی حەیاتت لە ذەقەندا[٦] ]
هێشتا دڵەکەم سەرخۆشە نایێتەوە سەرخۆ
ساقیێ بە کەرەم دوێنێ کە جامێکی بە مندا[٧]
ماچێکی دەمت خوێنی شەهیدی سەری زولفە
سائەو دەمە وابێنە کە من خۆم لە رەسەندا[٨]
زولف و روخ و لەب ، عاریض و خەط ، ذایقە بەخشن
وەك زوهرە لەشەو ، مەی لە قەدەح ، گوڵ لە چەمەندا
کەی بەستەیی زەڕڕێکە دوصەد بەرقی لوئالێ ؟
ئەو خەندە مەگەر موعجیزە وادێ بە دەهەندا
بۆ رۆژی نیثاری قەدەمت ئەشکی ( وەفایێ )
مرواریيە پەروەردە لە نێو کانی یەمەندا

**( ٩ )**

لێوەکەی ئاڵت دەڵێن : عاشق لە سوتان بەردەدا
زەڕڕەیەك نورە بەڵێ ئاگر لە ئینسان بەردەدا
من لە سیڕڕی حیکمەتی چاوت عەجەب ماوم ، عەجەب !
ئەو نەخۆشە خوێنی قەلبی من بە موژگان بەردەدا

---

(٥) تەشنە : تینو .
(٦) ذەقەن : چەناکە .
(٧) لە (جامێکی بەمندا) و (گریەیی مندا) دا ئەگەر پەیڕەوی تەواوی سەرەوای هەمو شیعرەکان بکرێ دەبێ لە هەردو جێگەکەدا (مەندا) بخوێنرێتەوە .
(٨) رەسەن : پەت و گوریس .

ئەژدەهای زولفت طەلیسمێکە لە سیحری بابلێ
میهری ئاگر شوعلە دەگرێ ، ماهی تابان بەردەدا
هیندویی خاڵت وەنێو باغی جەماڵت کەوتوە
باغەبان خانەخەرابێ ! بۆچ گوڵستان بەردەدا ؟
لێوی یاقوت[1] ئەگەر قوتی رەوانی عاشقە
پێم بڵێ : وەجهی چیە ئاگر لە ئینسان بەردەدا ؟
زاری تۆ گوڵزارە خۆ ، بۆچ ئابی حەیوانی هەیە ؟
سەروی تۆ ئازادە ، بۆچ نارنج و رومان بەردەدا ؟
لێوی ئاڵت چاوی کاڵت بونە فیتنەی دین و دڵ
حەقیەتی ــ باللە ــ ( وەفایێ ) دەست لە ئیمان بەردەدا !

( ١٠ )

( ما رأيت الليل ان من لحظة صار الغدا )
( في الذوايب وجهك ام في الدجى شمس بدا ؟ )[1]
قەط نەهاتە دەست و جارێ نەبوە ئارامی دڵم
تا قیامەت داغی زولفانت لە جەرگی ئێمەدا
بمکوژی ، صەد جار دەرم کەی ، رۆی من و خاکی دەرت
( كيف يحرم سائل من بابك حاز الندى ؟ )[2]

---

( ٩ )

(١) (یاقوت) دەبێ وەکو یاقوتت بخوێنرێتەوە .

( ١٠ )

(١) ( لە کاتێکەوە رۆژ بوەتەوە شەوم نەدیوە . رۆی تۆبە لەنێو زوڵفتدا ، یان رۆژە لە تاریکی شەودا دەرکەوتوە ؟ ) .

(٢) (کەسێك لە دەرگای تۆ بەخششی دەسکەوێ چۆن بێبەش دەبێ ؟ ) .

ئاگری عیشقت لە رۆحم بەر بوە سەرتا قەدەم
وەك نەیستان هەر دەسۆتێم مات و خامۆش بێ صەدا
دڵ بە مەحضی روئیەتی زولفت بە رۆدا کەوت و مرد
مردم و نەمزانی : نە گەنج خستی نە ماری پێوەدا ؟
چەند بە ناز دێوو دەچێ سەرخۆش و شۆخ و شەنگ و مەست
ئەی گوڵی نازدار ، ئیلاهی ، بای خەزانت لێ نەدا !
باغ دەبێ هەر گوڵ فرۆش بێ یار کە دێتە پێکەنین
با دەبێ عەنبەر بە بادا ئەو کە زولفان بادەدا
دین و دڵ صەبر و قەرارم چۆتە رێگای یەك نەظەر
تۆ بڵێی ئەو شۆخە وا سەر مەستە قەط بێتە [٣] رەدا ؟
بۆچ برۆم لێ تێکدەتێی رۆت وەردەگێڕی ، چاوەکەم ؟
کابە کەچ بۆ ؟ قیبلە گۆڕا ؟ ماچێکم لەو لێوەدا !
دەست و دامان زولفەکەت کەوتۆتە بەرپێت و دەڵێ :
تۆ غەنی من بێ نەوا ، تۆ پادشاه و من گەدا
خەندە بەم شیرینییە ، دەم بەم نمۆنەی حیکمەتە
قەط ( وەفایێ ) نەبوە وا خۆش بێ : خەبەر بێ موبتەدا ! [٤]

– ١١ –

بە خۆڕایێ نیە سۆتاوی رۆتە عاشقی شەیدا
لە رۆتی دیوە جیلوەی ئاتەشی ( سینا ) لە سینەیدا

---

(٣) رەدا : بەڵێن دان ، رازیبۆن .
(٤) نالی لەم مەعنایەدا دەڵێ :

**« وەصفی روخساری لە فیکری بەنیئادەم بەدەرە »**
**« ئیبتیدای مەدحی دەمی وەك خەبەری بێ ئەثەرە »**

بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی نالی ، ل : ٤١١ .

کوتم : عەقدی (ثریا) ماهی من تەنگی شەکەرنەی بۆ
کەچی بۆ راستی ئیعجازی خۆی یارم لە خەندەیدا

عەصای فەتحی موسا کول بۆ بە موعجیزە شکافی کرد [١]
کە فیرعەونی خەطی هات و ئیحاطەی طۆری کولمەی دا

درۆت فەرمۆی[٢] حەزم بێ نایەڵم ، گەر راست دەڵێی سادەی !
فەڕەنگی قەومی دەججال ــ ئەی مەسیحا ــ دەوری کەعبەیدا

لە سینەمدا چ شیرین دڵ دەناڵێنێ بە مەحزوونی
وەرن لەو شێوە گوێ بگرن بە شین و شیوەنی بەیدا [٣]

مەکەن مەنعی ( وەفایێ ) چونکە سەر گەردانی جانانە
لەسەر دینێ کە شێخی خانەقا بردی کە تۆبەیدا

- ١٢ -

هەر کە دی جەنەت بە رۆدا[١] زولفی پڕتابی شکا
تاری[٢] سونبول ، حورمەتی گوڵ ، بەرگی سیرابی[٣] شکا

ماهی شەوئارام بە خەندە هات نیقابی کردەوە
ئاسمان نەظمی ( ثریا )[٤] شەوقی مەهتابی[٥] شکا

---

( ١١ )

(١) شکافیکرد : لەتی کرد .
(٢) (فەرمۆی) : (فەرمۆ) راسترە .
(٣) ( بەیدا ) وکو ( بیدا ) نوسراوە .

( ١٢ )

(١) بە رۆدا (ن) بە رۆیــدا .
(٢) تــاری (ن) نــازی .
(٣) ســیراب : تێراو ، تێرئاو .
(٤) ثریا : کۆمەڵە ئەستێرەیەکە . (کۆ) .

[ کارگاەخاکی بە سەر وەستا بەڕۆ و سینە بروت ! ][6]
نرخی قاقوم[7] ، قەدری خەز[8] ، بازاڕی سنجابی[9] شکا
دەوری طوری کوڵمی‌دا[10] فیرعەونی خەط چارەی نەهات
ئەی دریغا صەد کەڕەت مۆسا بەبێ تابی شکا !
طاقی[11] پەیوەستی برۆت وا بۆ بە قیبلەی خاص و عام
کەعبە گەر بۆ خۆی بزانێ پشتی میحرابی شکا
کەس نیە لەو نیکتە حاڵیم کا ( وەفایێ ) ! دولبەرم
خۆی دەمی هێنا ، ئەمن گەستم[12] ، دڵی بابی شکا !

- ١٣ -

غەمزەدەی زولفم بە غەمزەی چاوی حەیرانم دەکا
بەستەیی داوم فەڕەنگی تیرەبارانم دەکا
[ عاشقی زارم لەسەر هیچ ئەو نیگارە دەمکوژێ
طیفلی نادانم لەسەر ماچێ لە گریانم دەکا ]
[ داعیەی ئاوێنە دینی کوفرە نەك روحمێکی بێ
حەقیەتی بەو چاوە کاڵانە کە تاڵانم دەکا ]

---

(٥) مەهتاب : مانگەشەو .
(٦) کارگاه . . . (ن) (کارگاه خاك سروستان بردوه سینەء تراب) ئەم نیوە شیعرەم لە هەردوو نوسخەکەدا بۆ راست نەکرایەوە ، بۆیە لێرەدا وێنەی (ن)م بە رێنوسەکەی خۆی نوسی .
(٧) قاقوم : پێستێکی سپی و گەرمە لەبەر دەکرێ .
(٨) خەز : حەریر .
(٩) سنجاب : سمۆرە .
(١٠) کوڵم (ن) (گلم) دیارە هەڵەیە .
(١١) طاقی (ن) تاقی .
(١٢) گەستم (ن) گەزتم .

[ یاری من هەر گیز لە قەتلی عاشقی پەروا نیە
چونکە رۆمەت شەمعە بۆیە حەز بە سۆتانم دەکا ]
ئاو لە چاوانم لەبەر زولف و عوزارت دێتە خوار
دۆکەڵی ئەو مەجمەرە هەر دەم لە گریانم دەکا
[ من دەڵێم : یاقوت و رێحان خەططی کامیان خۆشترە ؟ ]
[ ئەو بە عەییارێ ئیشارەی لەعلی خەندانم دەکا ]
قامەتی تۆ نەخلی طورە طەلعەتی تۆ توری طور
دەم بەدەم وەجهی جیلوەت [ مەست ! ] و حەیرانم دەکا [1]
[ فیکری زولفت عیللەتە ، وەصفی دەمت ناکەم بەدڵ
نیکتەگۆیی پیشەمە سەودا پەرێشانم دەکا ]
[ رۆ لە ئەبرۆی تۆم دەکا چاوت بە موژگانی کەچی :
قیبلە نیشانم دەدا ، کافر موسوڵمانم دەکا ! ]
پێم دەڵێ : بگری ( وەفایێ ) گەر ئەسیری لێومی
یەعنی مرواریم دەوێ ، چی نرخی مەرجانم دەکا ؟!

## - ١٤ -

نەسیمی بادی نەورۆزێ شەمیمی عەبهەری هێنا
بەریدی عاشقان دیسا[1] پەیامی دولبەری هێنا

---

( ١٣ )

(١) ئەم نیوەشیعرە مامۆستا هێمن پێی وابو هەڵەی نوسەرە و بەم شێوەی خوارەوەبێ باشترە :

**« دەم بەدەم (وا) وەجهی جیلوەت (مەست) و حەیرانم دەکا »**

( ١٤ )

(١) دیسا (ح) دیسان (عەبهەر) : بە نەرگس و یاسەمین دەوترێ .

نەوید ئەی عاشقانی دڵنیگار یار[٢] هاتە سەر خەندە
صەدایی بولبولان دیسا درەختی گوڵبەری هێنا
مەگەر ڕوی کەوتە[٣] زولف و ڕوی حەبیبم بادی نەورۆزێ
حەیاتێکی بە دونیا داوە بۆی[٤] گوڵعەنبەری هێنا
بە فەتحی دڵ دەڵێی یار زولف و سینە و ڕوی وەدەرناوە
لە نەسرین و گوڵ و سونبول بەهار هات لەشکەری[٥] هێنا
دەڵێی چاوی منە هەوری بەهارێ دەم بەدەم دەگرێ
دەڵێی ئاهی منە بەرقی درەخشان ئاوری هێنا
هەوا چۆ پڕ بە دامانی دەر و دەشتان گوڵی کێشا
صەبا هات پڕ بە جێبی کۆهساران عەنبەری هێنا
لە نێو[٦] بەزمی وەنەوشە و جۆ و کەناران لالە پەیدا بۆ
بە تاریکێ خضر بۆ چەشمە شای ئەسکەندەری هێنا
کە ئیسلامی بەهار فتوای جیهادی کافری دەی‌دا[٧]
صنەوبەر نێزە ، گوڵشەن[٨] گورز و ، سۆسەن خەنجەری هێنا

---

(٢) دڵ نیگار یار (ح) دلفگار مار . مامۆستا هێمن لای وابۆ ئەم شیعرە ئاوایە:

**« نەوید ! ئەی عاشقانی دڵفیگار یار هـاتە سـەر خەندە »**
**« صەلا ! ئەی بولبولان دیسـا درەختی گوڵبـەری هێنا . »**

نەوید : موژدە .
صەلا : بانگ و هاوار . ئەوترێ : صەلام لێ رابێ .

(٣) ڕوی (ح) رێی . لە (ھ) یشدا بە (رێی) نۆسراوە و ، ئەمەش راستە .
(٤) بۆی (ح) بـۆ .
(٥) لەشکەری (ح) شەکری . دیارە ئەمەی (ح) هەڵەیە .
(٦) لە نێو (ح) لە بـەر .
(٧) دەی : یەکەم مانگی زستان ، بەفران بار .
(٨) گوڵشـەن (ح) گوڵبەن .

نیثار ئەفشان بە پائەندازێ سولطانی بەهار هاتن
سەمەن دیبا ، شەقایق ئەتلەس و ، گوڵ مەخمەری [٩] هێنا
لە شایی دارەگوڵ مەسنەدنشین بۆ هاتە پشکوتن
چەمەن تەختی زومەڕڕەد، [ طل ! ][١٠] یاقوت ئەفسەری[١١] هێنا
لە بەزمی نێرگس و نەسرین بە دەفعی[١٢] چاوەزاری گوڵ
وەنەوشە دەستە دەستە عوّد و ، لالە مەجمەری[١٣] هێنا
لە مەیخانەی چەمەن بەزم و[١٤] طەرەبیان گرت قەدەح نۆشان
شەقایق[١٥] بادە ، زەنبەق[١٦] شیشە ، نێرگس ساغەری[١٧] هێنا
لە چەهچەی ساز و نەغمەی عەندەلیبان[١٨] سوّت هەمۆ دونیا
صەدایی تارزەن ، ئاوازی خۆش‌خوان ، ئاوری هێنا
حیکایاتی غەریبەی پێیە بولبول جوملە خۆکردی
دەڵێی چاپاری[١٩] ئێران رۆژنامەی ئەختەری هێنا

---

(٩) مەخمەر (ح) مەجمەر . (ئەفشان) لە (خ)دا بە (ئەفسان) نوسراوە .
(١٠) طل (ح) گوڵ لە . ئەم نیوە شیعرەم بۆ راست نەکرایەوە .
(١١) ئەفسەر : تاج .
(١٢) بە دەفعی . . . ئەم شیعرە لە (ح)دا تەواو نەکراوە .
(١٣) مەجمەر : ئاگردان ، مەقەڵی .
(١٤) بەزم و (ح) بەزمی . شیعرەیش لە (ح) دا ناتەواوە .
(١٥) شەقایق : گوڵێکی سوّری جوانە .
(١٦) زەنبەق : گوڵێکی جوانی بۆن خۆشە ، گەلێ جۆری هەیە .
(١٧) ساغەر : پیاڵەی شەراب .
(١٨) عەندەلیب : بولبول .
(١٩) چاپار : وڵاخی پۆستە . لە مەوبەر ئەو سەردەمەی کەرەسەی هاتوچۆی گورج و گۆڵ پەیدا نەبۆبۆ ، بۆ مەبەستی ئیش‌وکاری پۆستە کەڵکیان لە ئەسپ و وڵاخی سواریێ وەرگرتوە و لە سەر رێگاکاندا چەند قۆناخ دانراوە و ، هەر قۆناخێك چەند ئەسپی چاپاریێ چاکی تێدا راگیر کراوە، بەو ئەسپانە وتراوە : ئەسپی چاپاریێ . ئەم شیعرە ئەوە دەگەیەنێ لە سەردەمی (وفایێ) دا رۆژنامەیەك بە ناوی ئەختەر بۆبێ .

به شەوقی ڕوویی لالە و گوڵ لە باغاندا[٢٠] چراغانە
دەڵێی باغی جەنەت ئەمساڵ بەری حۆر و پەری هێنا
لە گوڵشەندا ڕەیاحین مەست و شادابی[٢١] هەوای خۆشن
دەڵێی ڕیضوانە بۆ ئەهلی بەهەشتی کەوثەری هێنا[٢٢]
شکۆفەو گوڵ بە عیشوە و خەندە ئارامی دەرۆنیان دا[٢٣]
بەهار بۆ خەستەکانی خۆی چ شیر و شەککەری هێنا ؟
بە زەرد و سوورەوە خەملیوە[٢٤] بۆ دامادی[٢٥] بولبول هات
وەرەق (معجز) ، ئەرض گولگونە ، شەونم[٢٦] زێوەری هێنا
هەموو کەس چاوەڕوانی[٢٧] لێك دەکەن وەك سورمەیان دیبێ
مەگەر بایی سەبا[٢٨] خاکی گوزاری دولبەری هێنا
چ دولبەر ؟ ئافتابی[٢٩] ماهڕۆیان و[٣٠] شەکەر لێوان
کە خەندێکی لە[٣١] سەحرا گوڵ لە دەریا گەوهەری هێنا

---

(٢٠) لە باغاندا (ح) لە باغان وا .
(٢١) شادابی هەوای (ح) شاداب و هەوا .
(٢٢) لێرە بە دواوە لە (خ)دا نیە ، وا دەردەکەوێ نوسەر یان دەستی نەکەوتوە. یان بۆی ساغ نەکراوەتەوە ، یان هەر هۆیەك ، بە ئەندازەی ئەو پێنج شیعرەی بۆ بڕداوە ، ئێمە ئەو پێنج شیعرەمان لە (ھ)وە لە گەڵ بەراوردی (ح)دا تەواو کرد .
(٢٣) ئارامی دەرۆنیان دا (ح)ئارام و دەوڵەتیان دا .
(٢٤) خەملیوە (ح) غەمزیوە .
(٢٥) دامادی (ح) داماد و . داماد :
(٢٦) شەونم (ح) شەبنم .
(٢٧) چاوەڕوانی ... (ح) چاوەڕۆنی لێدەکەن (وکبرمیان دینی ! ) .
(٢٨) بایی سەبا (ح) بادی صەبا .
(٢٩) ئافتاب : هەتاو .
(٣٠) ماهڕۆیان و ... (ح) ماهڕۆیان ثەنایشگری ...
(٣١) لە (ح)دا هەردوو (لە)کە بە (بە) نوسراوە .

بەبێ شاباشی سەر بە قسەی [32] (وەفایێ) گوڵچرا نابێ
کە بولبول[33] هەر زمانی هەن هەندە پەروانەش سەری هێنا

(٣٢) بەبێ شاباشی... (ح) بەبێ شاباش سەری قسەی وەفایێ گوڵ چراغ..

(٣٣) کە بولبول ... (ح)کە بولبول هەر زوبانی هەرزە پەروانەی سەری ... .
ماموّستا هێمن لای وایە ئەم نیوە شیعرە دەبێ ئاوابێ :

**(( کە بولبول هەر زمانی هانی پەروانەش سەری هێنا )) .**

## پیتی بێ

**( ١ )**

بۆ لەبی جانان ــ بەچاوت ــ من ئەوا بوٚمە کەباب
( دوستان ساقی کجا تا در دهد جام شراب ؟ ) [١]
شەو بەڕۆژ ئالاوە یا سونبول لە دەوری بەرگی گوڵ ؟
( یا پریشان گشته بر روی تو زلف پر ز تاب ؟ ) [٢]
دا بزانن ڕۆژ و شەو هەردوو لە لایەك دێنە دەر
( زلف روی خود عیان کن بر فگن بند نقاب ) [٣]
ذەوقی خەندە و شەوقی جیلوەی تۆیە حەیرانم دەکەن
( شهد و شکر بین که ریزد از تکلم افتاب ) [٤]
ماچی لێوت ئەو دەمەی خۆشە کە بێیە پێکەنین
( خوش بود گل بشکفد بلبل شود زو کامیاب ) [٥]

---

(١) دۆستان ساقی لە کوێیە تا جامی شەرابم بداتێ .

(٢) یا زولفی پڕ لەتاو بەسەر ڕوی تۆدا بڵاوبوەتەوە ؟

(٣) زولف و ڕوی خۆت دەرخەو بەندی چارشێو لادە لەسەری .

(٤) کاتێك هەتاو ( کە دۆستەکەیەتی ) قسە ئەکات ، ببینە چۆن شەهد و شەکەر دەڕژێنێ .

(٥) جوان دەبێ کاتێ گوڵ دەپشکوێ و بولبول لێیەوە بەختەوەر دەبێ .

مەوجی گریانم گەیشتە رۆی و چاوی لێ نەکرد
( سیل بر گلشن زد و نرگس نمی خیزد ز خواب ) (٦)
لەو دەرە مەمکۆژە چونکە شێتی زولف و رۆیی تۆم
( عاشقم صید حرم ، سودایی و مست و خراب ) (٧)
قەط بە مفتی دامەنێ ئیدی (وەفایێ) فرصەتە
( گوشەء گلزار و ، جام بادە و ، بانگ رباب ) (٨)

---

(٦) لافاو دای بەسەر گوڵزاردا کەچی نێرگس لەخەو رانەپەڕێ .

(٧) من عاشقم ، من نێچیری حەرەمی کەعبەم ، من شێت و مەست و سەرخۆشم .

(٨) گۆشەی گوڵزار و ، جامی مەی و ، بانگی روباب .

## پیتی تێ

**( ١ )**

ئەلئەمان سەر تاقەدەم سوتام و جانانم نەهات
چاو لە سورمەی خاکی رێ بۆم راحەتی جانم نەهات
خاڵ و خەط گوڵزار و رەنگی شۆخی بێ باکم نەدی
زولف و رو هیندو فەرەنگی شاهی خوبانم نەهات
ئەی عەجەب گریام وەکو هەوری بەهاران و کەچی
پێکەنینی ئەو گوڵەی کاکۆڵ پەرێشانم نەهات
چاوی خوێنین غەرقی پەروین بو لەبێ میهری[1] گوڵم
مات و حەیرانم لەسەر چی ماهی تابانم نەهات ؟
حەڵقەیی زوننار ی[2] زولفی بو بە میحرابی دۆعام
تورکی کافرکێش و یاری نامو سوڵمانم نەهات

---

**( ١ )**

(١) میهر : میهر ناوە بۆ گەلێ شت ؛ وەك : فریشتەی خۆشەویستی ، مانگی حەوتەمی ساڵی شەمسی ، جۆرەگیایەك ... تاد لێرەدا مەبەست خۆشەویستی و مەحەببەتە .

(٢) زوننار : جۆرە هەودا و پەتێکی تایبەتیە مەسیحی لە پشتیان دەبەست.

تەشنەلەب دیوانە بۆم ، سەرگەشتەیی ظولماتی غەم
دولبەری بالآ بلآوم ئابی حەیوانم نەهات
کەعبەیی رۆحم ، حەبیبی من ، عەجەب پەیدا نەبۆ
قیبلەکەی دینم طەبیبی دەردی پەنهانم نەهات
نەی صیفەت نالینمە ، بولبول طەریقەت شینمە
شای شەکەر لێوان[٣] گوڵو ئەگریجە لەرزانم نەهات
بۆ بە خوێن غونچەی دلم ، نەمدی هەوای خەندەی گولم
سۆت دەر و ژۆرم ، صەدای بەرقی بەهارانم نەهات
چەند بە چەند گریام هەوای عیشقم لەسەر خالێ نەبۆ
غەرقی طۆفان بۆم کەچی تەسکینێ سۆتانم نەهات !
وەك ( وەفایێ ) تا بەکەی بگریم بنالێنم بلێم :
ئەلئەمان سەر تاقەدەم سۆتام و جانانم نەهات .

( ٢ )

نیگارا ئەی بە غەمزە ئافەتی دڵ چاوی بیمارت
ئەمان سەر تاقەدەم سۆتام لە دۆرێ نوری دیدارت
دەسا روحمێ وەفادارم بە حالی دادو هاوارم
کە وەك بولبول دلی زارم دەنالێ بۆ گولی زارت
سەرم ناوێ ئەگەر نەیخەم بە حەلقەی پەرچەم و چاوت
دلم ناوێ ئەگەر نەیکەم بە فیدیەی چاوی عەییارت
ئەسیری زولفی خامی تۆم ، شەهیدی رەمزی چاوی تۆم
ئەمن گیراوی داوی تۆم ، بە صەد جێ دڵ بریندارت

---

(٣) لە مامۆستا (هێمن) م بیست کە مەبەستی (وەفایێ) لە (شای شەکەر لێوان) سەیزادە مەریەمێکی سابلاخێ بوە و مامۆستا (هێمن) خۆی ئەو باسەی لە سەیزادە بیستوە .

